# ئایا راسته

# عیسا (عليه السلام) کوڕی خوایه ؟؟!!



نووسینی

## اسامه ملا عبدالواحد باڵەکی

چاپی یەکەم

١٤٢٠ کۆچی | ١٩٩٩ زاینی



# ئایا راستە عیسا (عليه السلام) کوری خوایە؟!!!

نووسینی

**اسامە ملا عبدالواحد بانەکی**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ وَقَالَ الْمَسِيحُ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ ۞ لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلَاثَةٍ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا إِلَٰهٌ وَاحِدٌ وَإِنْ لَمْ يَنْتَهُوا عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ۞ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى اللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ۞ مَا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ وَأُمُّهُ صِدِّيقَةٌ كَانَا يَأْكُلَانِ الطَّعَامَ انْظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ الْآيَاتِ ثُمَّ انْظُرْ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ۞ قُلْ أَتَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا وَاللَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ المائدة ٧٢-٧٦.

ناوی کتاب: ئایا ڕاستە عیسا ﷺ کوڕی خوایە؟!!!
نووسینی: اسامە ملا عبدالواحد مالکی
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
هەلچنینی ووشەکان: نووسینگەی ویندۆز بۆ کۆمپیوتەر

چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین - هەولێر

چاپی یەکەم ١٩٩٩
ژمارەی سپاردن ([illegible]) لە ١٩٩٩/٩/١٣
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری و هونەر - هەولێر

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على افضل الانبياء والمرسلين وعلى اله وصحبه اجمعين اما بعد ...

لە سەرەتای دروست بونی مرۆڤەوە خوای گەورە کۆمەڵێکی لەنێو ئەم مرۆڤانەدا هەڵبژاردوە بۆ گەیاندنی پەیامی خوا بە مرۆڤ. کە ئەم کۆمەڵەش پێیان دەوترێت پێغەمبەران (الانبياء) عليهم الصلاة والسلام کە ژمارەیان لەسەر ریوایەتی راست (١٢٤٠٠٠) سەد و بیست و چوار هەزارە. وە لەنێو ئەم ژمارەیەدا (٣١٢) سێ سەد و سیانزەیان خاوەن ئوممەتن وەپێیان دەوترێت (الرسل) عليهم الصلاة والسلام وانە قاسید و رەوانەکراوی خودا. کە ناوی بیست و پێنجیان لەقورئانی پیرۆزدا هاتوە: ادم- ادريس- نوح - ابراهيم - صلح - شعيب - الياس - اليسع - داود - سليمان - اسماعيل - اسحق - يعقوب - يوسف - زكريا - يحيى - هود -لوط -ايوب - يونس - ذو الكفل - لقمان - موسا - عيسا -محمد المصطفى عليهم الصلاة والسلام.

وە لەنێو ئەم ژمارەیەدا (٥) پێنجیان پلە و پایەیان لەلایەن یەزدان لەوانیتر بەرزترە لەبەر بەزەحمەت گەیاندنی پەیامەکە و ماندوبون و ئازارخواردن لەپێناو بەجێگەیاندنی فەرمانی خودا ئەمانەش : (ابراهيم - نوح -موسا -عيسا - محمد ) عليهم الصلاة والسلام. وە لەنێو ئەم پێنج پێغەمبەرەش حەزرەتی محمد ﷺ لەهەمویان گەورەترە وە پەیامەکەی بۆ مرۆڤایەتی بەرییە هەر لەرۆژی پەیدابونی تارۆژی دوایی وە لەهەموو کات و ساتێکدا وە لەهەموو شوێن و وڵاتێکدا بەڵێ کەوابو ئاینی پیرۆزی ئیسلام

سەرەرای ئەوەی دان بەئاینەکانی تری ئاسمانی دادەنێ بەلام بۆ خۆی ئاینێکی کۆتا ئاینە واتە (خاتم الانبیان) وە پێغەمبەرانی تر هەریەکە بۆ گەلەکەی خۆی هاتوە وە ئاینەکەی تایبەت بووە بەگەلەکەی بەس بەلام ئاینی ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام بۆ هەموو گەلانی سەرتاسەری جیهانە و لەهەموو ساتێك تاڕۆژی دوای. هەروەك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت ( وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ ) واتە ئیمە ئەی محمد ﷺ ئەتۆمان ڕەوانە کردوە بۆ ئەوەی ببیتە ڕەحمەت و بەرەکەت بۆ مرۆڤ و پەری لەعەرد و دونیادا.

وە هەروەکو پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرمویەتی: ( أُعْطِيتُ خَمساً لَمْ يُعْطَهُنَّ أحَدٌ قَبْلِي : نُصِرْتُ بالرُّعْبِ مَسِيرةَ شَهْرٍ وجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ مَسْجِداً وطَهُوراً فأيّما إمْرِئٍ مِن أُمَّتِي ادْرَكَتْهُ الصَّلاةُ فَلْيُصَلِّ. وأُحِلَّتْ لِيَ الغَنائِمُ و لَمْ تَحِلَّ لأحَدٍ قَبْلِي. وأُعْطِيتُ الشَّفاعَةَ. وكانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ الى قَوْمِهِ خاصَّةً وبُعِثْتُ إلى النَّاسِ عامَّةً ) واتە: پێنج شت بەمن بەخشراون کە بەهیچ کەسێکی‌تر پێش من نەبەخشراون :-١- لەشەردا سەرکەوتنم پێدراوە و ترس کەوتۆتە ناو دڵی دوژمنم کە هێشتا یەك مانگ ڕێگە لەیەکتر دووریین.

٢. زەوی بۆمن و ئومەتەکەم کراوتە مزگەوت و پاك کەرەوە واتە بەخۆڵ سەر زەوی دەست نوێژ هەڵدەگیرێ بۆ نوێژکردن ئەگەر ئاو دەست نەکەوت واتە (تیمم) جا هەرکەسێك گەیشتە کاتی نوێژ لە هەر کوێیەك بو با نوێژەکەی بکات ئەمانەت نوێژی مزگەوت لەگەڵ خەڵکدا خێری زیاترە.

٣. وەتالانی دوژمن واتە (غنائم) بۆ من حەلال کراوە بەلام بۆ پێغەمبەرانی تر قەدەغە بوو.

٤. وە شەفاعەتی بەرز واتە (الشفاعة العظمى) کە لە رۆژی دوایدا دەبێت بە من بەخشراوە واتە پارانەوە لەبەر خودا بۆ دەست پێکردنی حیساب لەگەڵ خەڵکدا و رزگار بونیان لە ئێش و ئازاری پێش حیساب.

٥. وە هەر پێغەمبەرێك بۆ گەلەکەی رەوانکراوە بەتایبەت بەلام من بۆ گشت مرۆڤ رەوان کراوم.

وە ئێمەی موسوڵمان بڕوامان بەگشتیان هەیە و جیاوازی ناکەین لەنێوانیاندا بەلام لەروی بەرنامە ئەوا قورئانی پیرۆز کۆتایی بەهەموبان هێناوە هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ﴾ البقرة ٢٨٥.

وە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴾.

جا بۆ رێزلێنان لە حەزرەتی عیسا ﷺ. وە تێنگەیاندنی ئەو کەسانەی کە بە کوری خوای تێدەگەن و لە سنوری خۆی بەرزتری دەکەنەوە هەروەکو پێغەمبەری خۆشەویست دەفەرموێ: ( لا تطروني كما أطرت النصارى عيسى ابن مريم بل قولوا عبدالله ورسوله).

واتە بەرزم مەکەنەوە لە سنوری خۆم هەروەک مەسیحیەکان عیسایان بەرزترکردەوە لە سنوری خۆی بەڵکو بڵێین بەندەی خوا و رەوانەکراوی خودا. جا بۆ ئەم مەبەستە ئەم پەرتووکە دەخەمە بەر دەستی خوێنەرانی ئازیز. جا ئەگەر کەم و کوریەکیش هەبێت هیوادارم کە خوێنەران کەم و کوریەکە راست بکەنەوە و دوعای خێرم بۆ بکەن چونکە هەر تەنها خوای گەورەیە هەڵە ناکات و دورە لە هەموو نوقسانیەک : (رَبَّنا تَقَبَّلْ مِنّا إنَّكَ أنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ وَتُبْ عَلَيْنا إِنَّكَ أَنْتَ التَّوابُ الرَّحِيمُ).

نوسەر/ باڵەکیان
١٩٩٨ / ٣ / ١٥

## دەسپێك



ناوی حەزرەتی عیسا ﷺ لـــە قورئانی پیرۆز (٥٩) پەنجا و نۆ جار هاتوە بەسێ جۆر هەروەك لەخوارەوە ژمارەم بۆ داناوە:

- المسیح = ١١ جار
- عیسا = ٢٥ جار
- أبن مریم = ٢٣ جار

## نەژادی عیسا ﷺ لەلای نەساراکان

متی دەڵێ : یسوع کوڕی یوسفی دارتاشە یوسف کوڕی یعقوبی کوڕی مثانی کوڕی یعازری کوڕی یهودی کوڕی صادوق ی کوڕی عازوری کوڕی یاقیم ی کوڕی زربابل ی کوڕی شلتائیل ی کوڕی یکنیای کوڕی یوشیای کوڕی ئامون ی کوڕی منسای کوڕی حزقیای کوڕی ئاحازی کوڕی یوثام ی کوڕی عزیان ی کوڕی یورام ی کوڕی یهوشافط کوڕی ئەسیای کوڕی رحبعام ی کوڕی سلیمان ی کوڕی داودی کوڕی یسی کوڕی عوبیدی کوڕی سلمون ی کوڕی نحشون ی کوڕی عمیناداب ی کوڕی ئارام ی کوڕی حصرون ی کوڕی فارص ی کوڕی یهوذای کوڕی یعقوب ی کوڕی اسحاق ی کوڕی ابراهیمە.

وەئینجیلی لۆقاش (٥٢) باپیری عیسا ﷺ دەژمێرێ و هەر لە یوسفی دارتاش تا ابراهیم ﷺ بەڵام لە چەند جێگایەك لەناوەکان لەگەڵ (متی) جیاوازی هەیە.

## بۆچی مەسیحیەکان یسوع دەدەنە پاڵ یوسفی دارتاش

لەبەر ئەوە یسوع ناوی دەدرێتە پاڵ ناوی یوسفی دارتاش چونکە بەگوێرەی ئینجیلەکان مەریەمە (علیها السلام) پێش لەدایك بوونی عیسا ﷺ لەژێر مارەی ئەم یوسف ناوە بوە وە ئەم باسەش چونکە نە لە قورئانی پیرۆز و نە لە فەرموودە پیرۆزەکانی پێشەوامان محمد ﷺ نەهاتوە ئێمە لێی بێ دەنگ دەبین وە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی ( حَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَ

لاحرج) واته قسه لەبەنوا ئیسرائیلیەکان وەرگرن و هیچ تاوانی لەسەر نیە. جائیمە ناتوانین بڵێین ئەم باسە راستە یا درۆیە. وە دەبێت حەزرەتی مەریەمش (علیها السلام) وەکو ئافرەتانی تر مارەی لەپیاوێك برابێ بەلام كە رووداوی لە دایك بوونی عیسا ﷺ پەیدا بوو ئەم مارەیی و مارە بڕییە كۆتایی پێهاتووە.

## مەریەمەی کچی عمران

عمـران ی بـاوكی مەریەمـە پیـاوێكی نـاودار بـوە لـە نێـو بـەنو ئیسرائیلیەکاندا. وە ژنەکەی ناوی (حەننە) دەبێت. وە لەبەر ئەوەی ئەم ژن و پیاوە هیچ کوریان نەبوە و عمرانیش پێی خۆش بـوە كە خـوا كوڕێكـی بداتێ میراتەکەی بۆ بەجێ بمێنـێ و جێگـای بـاوكی بگرێتـەوە لـەناو ئـەم گەلەدا. جا رۆژێکیان (حەننە) ی دایکی مەریەمە سك پڕ (حاملە) دەبێت وە لەبەر مەراقی پەیدابونی كوڕێك روو دەكاتـە قـاپی خـوا دەڵێـت: هـەروەكو خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا بۆمان دەگێرێتەوە : ﴿ إِذْ قَالَتِ امْرَأَتُ عِمْرَانَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا ﴾ واتە ژنی عمران رووی لەخوا کرد و ووتی خودایە من ئەوەی لەناو سكمدایە پێشكەشم كرد بەتۆ؛ واتە بیكەم بەخزمـەتكاری (بیـت المقـدس) جـا تـەنها منـاڵی نـێر (كـوڕ) دەكرایـە خزمەتكاری مزگەوتی قدس. جا خوایە گیان تۆش حەملەکە بکە بە كوڕ و قەبوڵ بكە ﴿ فَتَقَبَّلْ مِنِّي إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ آل عمران ٣٥.

واتە وەری بگرە لێم و قەبوڵی بکە چونکە هەرتۆ لایەقی ئەم کارەی و بیسەری نزا و زانا و دانای بەناو دڵی بەندەکانت. جا کە (حەننە) منالی بو سەیری کرد منالەکە کچە واتە (مەریەمە) دیسان روی لەخوا کرد و ووتی:

﴿ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنْثَى وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالْأُنْثَى وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴾ آل عمران ٣٦.

واتە دایکی مەریەمە وتی : خوایە گیان من داوای کورم کردبوو ئێستاش منالەکەم کچە وە تۆش لە هەموو کەس باشتر دەزانی منالەکە چیە وا منیش ناوم نا مەریەمە و وە مەریەمە و نەوەکانیشی بەتو دەپارێزم لە شەیتانی نەگریس.

**تێبینی** : ئەم باسە لە قورئانی پیرۆز وەرگیراوە هەر وەکو لەم ئایەتە پیرۆزانەی سەرەوە دەردەکەوێ تەنها ناوی (حەننە)ی دایکی

- مەریەمە نەهاتوە ئەمەش زانایان لە پەرتوکە مێژوییەکان و ئینجیلەکان وەریان گرتوە.

## مەریەمە لە (بیت المقدس)

پاشان کە تەمەنی مەریەمە گەیشتە سێ تا چوار ساڵ - هەر چەندە هەندێ لە زانایان دەڵێن هەر لە دوای لەدایک بونەوە - بردی بۆ بیت المقدس کە ژمارەیەکی زۆری لە پێغەمبەرەکانی بەنو ئیسرائیلیەکانی لێبوو بۆ ئەوەی لەناو ئەوان پەروەردە بێت وە خورەوشتی ئەوان هەڵبگرێت. وە یەکێك لەم پێغەمبەرانە (زەکەریا) بو کە مێردی خوشکی (حەننە) بو واتە پوری

مەریەمە خێزانی ئەو بوو. جا ئەم پێغەمبەرانە لەبەر ئەوەی دەیان زانی کە ئەم کچە ئافرەتێکی بەرز و چاکی لێدەردەچێت و نیشانەی ئەولیای لێ دیار بوو هەریەکەیان دەیویست لەلای خۆی پەروەردە بێت لەبەر ئەوە قورعەیان کرد. وە قورعەکەش حەوزێکی ئاو لەناو مزگەوت هەبوو هەریەکەو پێنوسەکەی (قلم) فڕێ دەدایە ناو حەوزەکە پێنوسی کامەیان سەر ئاو بکەوتایە ئەویان دەیبردەوە هەر وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَامَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴾ آل عمران ٤٤ واتە یا محمد ﷺ ئەم باسانەی پێغەمبەرانی رابردوو کە بۆت دەگێرینەوە هەواڵی نەزانراون تەنها خوا ئەیزانێ و بۆ تۆی ئاشکرا ئەکا. خۆ تۆ لە لای ئەوان نەبوی کە پێنوسەکانیان فڕێدایە ناو حەوزی ئاو بۆ ئەوەی لە قورعەکە ببەنەوە بۆ بەخێوکردنی مەریەمە کە کێشەیان بوو لەسەری.

بەڵێ هەر لەهەمان سورەتی قورئانی پیرۆزدا کە سورەتی آل عمران خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ آل عمران ٣٧. واتە نزا و پاڕانەوەی دایکی مەریەمە لێرەدا گیرابوو قەبول کرا کە ووتی خوایە من مەریەمەم کردە خزمەتکاری ماڵی تۆ و تۆش مەریەمە و نەوەکەی لەشەیتان بپارێزە ئەم دوعایە قەبول کرا و خوای گەورە

مەریەمەی پەروەردە کرد بە پەروەردەیەکی جوان و باش وە زەکەریای کردە بەخێوکەری، وە هەرکاتێك زەکەریا دەچوە ژووری مەریەمە کە لەم ژوورەدا عیبادەتی خوای دەکرد لەگەڵ ئەم تەمەنە بچوکەیدا دەیبینی جۆرەها خواردەمەنی لایە بە زستان سەوزەی هاوینانی لایە و بە هاوین میوەی زستانی لایە، زەکەریاش سەری سورما و ووتی ئەی مەریەمە ئەم خواردنەت لە کوێ بۆ هات ئەویش وەڵامی دایەوە کە لەلایەن خواوە بۆم هاتوە وە خوداوەندیش ئەگەر بیەوێ رزق بداتە کەسێك زۆری دەداتێ حیسابی وەرز و کات و کەم و زۆری لەگەڵ ناکات. بەڵێ فریشتە ئەم خواردنەی بۆ مەریەمە دەهێنا چونکە مەریەمە دۆستێکی نزیکی خوا بوو.

## مەریەمە پێغەمبەر نەبو بەڵکو دۆستی خوا بوو

بەڵێ پێغەمبەرایەتی یەکێك لە مەرجەکانی ئەوەیە دەبێت پیاوبێت و ئافرەت نابێت بە پێغەمبەر بەڵام هاتنی فریشتە بو لای ئافرەتێك مانای ئەوە دەبەخشێت کە ئەم ئافرەتە پلە و پایەیەکی بەرزی هەیە لە لای خوای گەورە وە بەتایبەتیش مەریەمە (علیها السلام) کەپێغەمبەر محمد ﷺ دەربارەی فەرمویەتی: (أفضل نساء العالمین مریم بنت عمران و آسیا بنت مزاحم و خدیجة بنت خویلد) واتە گەورەترین و بەرزترین ئافرەتی جیهان مەریەمەی کچی عمران و ئاسیای کچی مەزاحیم کە ژنی فیرعەون بوو بەڵام باوەری بەموسا ﷺ هێنابوو وەخەدیجەی کچی خوەیلد کە یەکەمین خێزانی پێغەمبەر بوو ﷺ بەڵێ مەریەمە لەم پەرستگایە دا پەروەردە بوو تا تەمەنی گەیشتە (٩) ساڵان و ئافرەتێکی ژیر و تەواوی لێ دەرچوو.

## گیرا نەبوونی دوعای حەننە

دوای ئەوەی دایکی مەریەمە دوعای لە خوا کرد کە حەملەکەی کور بێ بەڵام خوای گەورە کچی پێ بەخشی چەند هۆیەکی هەبوو:

١. لەوانەیە ئەگەر کور بوایە تەنها پیاوێکی سادەی خزمەتکاری بیت المقدسی لێ دەردەچوو هیچی تر.

٢. ئەو موعجیزەی خوای گەورە دەیویست پیشانی خەڵکی بدات بە لە دایک بوونی عیسا بەبێ باوك نەدەهاتە جێ.

٣. هەر دوعایەك ئەگەر قەبول نەبوو خوای گەورە لە لایەکی ترەوە سود بە خاوەنەکی دەگەیەنێ.

ئەوانە و زۆری تریش...

## لەدایک بوونی عیسا ﷺ لە قورئاندا

خوای گەورە روداوی لە دایك بوونی عیسامان ﷺ بۆ دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: ﴿ إِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ اسْمُهُ الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ ۝ وَيُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ الصَّالِحِينَ ۝ قَالَتْ رَبِّ أَنَّى يَكُونُ لِي وَلَدٌ وَلَمْ

---

١ ووشەی (وکهلا) بە پێی قسەکردنی عەقڵگەیە لەسەر ئەوەی کە عیسا ﷺ هەرماوە و هەر زیندووە چونکە لە کاتی بەرزبوونەوەیدا تەمەنی (٣٣) سی و سێ ساڵ بوو جا ئەگەر هەر لەو تەمەنەش بێتە خوارەوە ئەوا ووشەی (وکهلا) نەهاتە جێ بەڵام ئەم ووشەیە دەیسەلمێنێ عیسا ماوە و پیریش دەبێت

يَمْسَسْنِي بَشَرٌ قَالَ كَذَلِكِ اللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ إِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ ۞ وَيُعَلِّمُهُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ ﴾ آل عمران ٤٥-٤٨. واتە: لە كاتێکدا کە مەریەمە لە میحرابدا لەو جێگایەی کە عیبادەتی خوای گەورەی تێدا دەکرد. سەرقاڵی عبادەت کردن بوو. لەو کاتەدا فریشتەیەك (ملآئکة) چووە لای و ووتی : ئەی مەریەمە خوای گەورە مژدەت دەداتێ بەوەی کە کوڕێکت دەداتێ ناوی (المسیح) عیسای کوڕی مەریم ناودار و ناسراو لە دونیا و لە قیامەت. وە دەبێتە یەکێك لەو کەسانەی کە لە خوا نزیکن وە قسە و گفتو گۆ لە ناو بێشکە (لانك) دەکات وە بە پیری وە سروش (وحي) بۆ دەنێرین وە دەبێتە یەکێك لەو کەسانەی کە لە پیاو چاکان دەژمێردرێن. لێرەدا مەریەمە سەری سوڕما و چونکە منداڵ بەبێ باوك نابێ. ووتی خوایە گیان چۆن من منداڵم دەبێ کە هیچ پیاوێك بەناوی ژن و مێردایەتی دەستی لێ نەداوم خوای گەورە لەسەر زاری فریشتەکە ووتی: بەو شێوەیە خوای گەورە ئەگەر بیەوێت شتێك دوروست بکات بە کەیفی خۆی دوروستی دەکات وە ئەگەر ویستی لەگەڵ شتێك بێت پێی دەڵێ (کن) واتە ببە هەر ئەوەندە شتەکە بە تەواوی دێتە دی، وە مەریەمە بزانە ئەو منداڵە فێری نوسین و خوێندنەوە و حکمەت و کارزانی و فێری زانستی تەورات و (عهد القدیم ) و انجیل (عهد الجدید) دەکەین وە هەر لەو سورەتە خوای گەورە بومان دەگێڕێتەوە کە فریشتەی ناردوە بۆ لای مەریەمە و پێی

---

هەتا ئەو کاتەی دێتە خوار لە کۆتایی زەمان بۆ کوشتنی دەجال و جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلام

گوتوە: ﴿ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاءِ الْعَالَمِينَ ۞ يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ ﴾ آل عمران ٤٢-٤٣.

واتە: ئەی مەریەمە خوای گەورە تۆی هەڵبژاردوە و پاکی کردوی و هەڵی بژاردوی بەسەر ئافرەتانی جیهاندا ئەی مەریەمە بەندایەتی خوا بکە و کرنوش بۆ خودا ببە و رکوع بۆ خوا ببە). وە لە سورەتی (مریم) دا دەفەرموێ: ﴿ وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ إِذِ انْتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا ۞ فَاتَّخَذَتْ مِنْ دُونِهِمْ حِجَابًا فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ۞ قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَٰنِ مِنْكَ إِنْ كُنْتَ تَقِيًّا ۞ قَالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَامًا زَكِيًّا ۞ قَالَتْ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا ۞ قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِنَّا وَكَانَ أَمْرًا مَقْضِيًّا ﴾ مريم ١٦-٢١ واتە ئەی محمد ﷺ بۆ ئوممەتی خۆت باس بکە کە مەریەمەی کچی عمران لە جێگایەک عیبادەتی خوای دەکرد و هاتوو چۆی ناو خەڵکی نەدەکرد. ئێمەش روحی خۆمان کە حەزرەتی (جبرائیل)ە ﷺ ناردمان بۆ لای مەریەمە و لەسەر شێوەی بەنی ئادەم. کە مەریەمە چاوی بەم پیاوە کەوت و نەیزانی (جبرائیلە) وتی : من خۆم بە خوا دەپارێزم لە تۆ ئەگەر تۆ پیاوێکی خراپ بیت. بەڵام جبرائیل ﷺ وتی من رەوانە کراوی خوای گەورەم بۆ لای تۆ. بۆ ئەوەی مژدەت بدەمێ و هۆکارەکانی منال بوونت پێ ببەخشم. مەریەمە وتی جا چۆن من منالم دەبێ و کە مێردم

نەکردبێ و نافرەتێکی داوێن پیسیش نیم زینام کردبێ. جبرائیل ووتی ئەمە فەرمودەی خوایە و لای ئەو زۆر ئاسانە و فەرمانی کردوە بۆ ئەوی ئەو منالە کە لە تۆ بەبێ باوك پەیدا دەبێ بیکەن بە بەڵگە و موعجیزە وە رحمەتێکە لە لایەن خواوە بۆ خەڵکی. لەو کاتە جبرائیل بە هەناسەی خۆی فوویکی لە (زی) لای ژووری سینگی مەریەمە کرد و رۆیشت. لەگەڵ ئەمە روحی خوا کە جبرائیلە ئەم کارەی کرد. مەریەمە سکی پڕ بوو. واتە عیسا ﷺ کەوتە ناو سکی دایکی.

**چەند تێبینیەك:**

١. ابن عباس ﷺ دەفەرموێ قسەکردنی عیسا ﷺ تەنها ئەوەندە بوو لە کاتی لە دایك بوونی پاشان هیچ قسەی نەکرد تا گەیشتە تەمەنی قسەکردن.

٢. دروست کردنی باڵندە و فوو لێ کردنی و بوونی بە باڵندە زانایانی تەفسیر دەڵێن: کە باڵندەی دروست دەکرد لە قوڕ و فوی لێ دەکرد و دەبووە باڵندەیەکی زیندو بە فرمانی خوا ئەم باڵندەیە دەفڕی و دەرۆیشت لە پشت چیایەك دەمرد و دەکەوتە خوارەوە بۆ ئەوەی جیاوازی هەبێت لەگەڵ دروست کراوی خوا.

٣. کە فریشتە چووە لای مەریەمە پێ ووت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٖ مِّنۡهُ ٱسۡمُهُ ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ . . . ﴾ خو فریشتە قسەی لەگەڵ مەریەمە دەکرد راستەوخۆ بۆ ووتی (عیسی ابن مریم) بۆ نەی ووت (عیسی ابنك)

ئەمەش ئاماژە کردنە بۆ ئەوەی کە بزانن عیسا ﷺ تەنها لە مەریەمە پەیدا بووە و خەڵکی هەموو شوێن و زەمانێك بزانن. وە سەرکرت کردنی ئەوانەی دەڵێن عیسا کوری خوایە و بەشی هەیە لە خوایەتی وە بۆ رێز لێنان لە مەریەمە (علیها السلام).

٤. بۆ خوای گەورە وای کرد عیسا ﷺ نەخۆشی گوڵ و بەڵەك و کوێر چاك بکاتەوە و مردو زیندو بکاتەوە لەنێوان چەندەها دەرد و نەخۆشی تر، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو چونکە هەموو پزیشکەکان دەستەوەستان وەستاون بەرامبەر بەم نەخۆشیانە و چارەسەریان پێ نەکراوە و ناکرێ تاکو بزانن کە ئەمە هێزێکی خواییە لەگەڵ عیسا ﷺ.

## یا اخت هرون

ئایا بۆ خەڵکەکە بە مەریەمەیان ووت ﴿يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا﴾ مريم ٢٨ خۆ مەریەمە هیچ برای نەبوە و بەناوی هارون لێرەدا چەند رایەك هەیە :

١. هەندێك لە زانایانی تەفسیری قورئانی پیرۆز دەڵێن: مەریەمە لە نەوەی هارون بووە کە برای موسایە.

٢. دەڵێن پیاوێك هەبووە لەو کاتەدا ناوی هارون پیاوێکی خراپ و بێ دین بووە، جا مەریەمەیان (تشبیه)کردوە بەو.

٣. دەڵێن هارون لە سەردەمی مەریەمە هەبووە، پیاوێکی زۆر لەخواترس بووە جا مەریەمەیان( تشبیه) کردوە بەو، وەکو گاڵتەپێکردن واتە تۆ

وەکو هارون ئاین پەروەر و عیبادەت دەکرد. ئێستاش زینات کردوە و ئەم منالەت بووە. بەلام ئەم قسەیەیان کە پێیان دەووت زینات کردوە گوناهێك بوو دەیانکرد. چونکە مەریەمە زینای نەکردبو بەڵکو خوا ئەم منالەی پێداوە. جا باسی لە دایك بوونی عیسا لە قورئان و لە ئینجیل زۆر جیاوازیان نییە. بەلام زۆر باس هەیە لە تورات (عهد القدیم) لە ئینجیل (عهد الجدید) باسیان نەکردوە. وەکو باسی داری خورماو باسی ئەو کاتەی ئاوەی بۆ مەریەمە دەربوو.

## لە دایك بونی عیسا ﷺ لە ئینجیلدا

متێ أیە ١٨ ص١ : ( اما ولادة یسوع المسیح فکانت هکذا لما کانت مریم امه مخطوبة لیوسف قبل ان یجتمع بها وجدت حبلی من الروح القدس. فیوسف رجلها اذ کان بارا و لم یشأ یشهرها اراد تخلیتها سرا. ولکن فیما هو منفکر في هذه الامور اذا ملاك الرب قد ظهر في حلم قائلاً: یایوسف ابن داود لا تخف ان تاخذ مریم امراتك لان الذي حبل به فیها هو من الروح القدس. فستلد ابنا وتدعو اسمه یسوع لانه یخلص شعبه من خطایاهم).

ئینجیلی لوقا: ص١ آیة: (٢٦) وفي الشهر السادس ای من حمل الیصابات زوج زکریا ارسل جبریل الملاك من الله الی المدینة من الجلیل اسمها ناصرة (٢٧) الی عذراء مخطوبة یوسف واسم العذراء مریم (٢٨) فدخل الملاك وقال سلام ایها المنعم علیها الرب معك مبارکة انت في النساء (٢٩) فلم رأته اضطربت من کلامه وفکرت ما عسی ان تکون هذه التحیة (٣٠) فقال لها الملاك لا تخافي یا مریم لانك قد وجدت نعمة عندا لله (٣١) وها أنت ستحبلین

وتلدين ابنا وتسمينه يسوع (٣٢) هذا يكون عظيماً وابن العلي يدعى ويعطيه الرب الاله كرسي داود ابيه (٣٣) ويملك على بيت يعقوب ولا يكون لملكه نهاية (٣٤) فقالت مريم للملاك كيف يكون هذا وانا لست اعرف رجلاً (٣٥) فأجاب الملاك وقال لها الروح القدس يحل عليك وقوة العلي تظللك فلذلك ايضاً القدوس المولود منك يدعى ابن الله (٣٦) وهو ذا ( اليصابات) نسيبتك هي أيضاً حبلى بإبن في شيخوختها وهذا هو الشهر السادس لتلك المدعوة عاقر (٣٧) لإنه ليس شيء غير ممكن لدى الله (٣٨) فقالت هو ذا انا امة الرب ليكن لي كقولك فمضى من عندها الملاك.

**واته : لە مانگی شەشەمی سك پڕی (یصابات) خێزانی حەزرەتی زەکەریا ﷺ کە پلکی مەریەمە بوو جبرائیل چووە لای مەریەمە لە ناوچەی جلیل لە شاری ناصرە بۆ لای دەستگیرانی یوسفی دارتاش کە ناوی مەریەمە بوو لێی چووە ژوورەوە و ووتی سڵاوی خوات لێ بێت ئەی چاکە و نعمەت لەگەڵ کراو خوا لەگەڵ تۆیە و تۆ زۆر پیرۆزی لە نێو ئافرەتان، کە مەریەمە دیتی ترسا و بیری کردەوە کە ئەم جۆرە سڵاوە چی بوو، بەڵام جبرائیل ووتی مەترسە، چونکە تۆ چاکەت لەگەڵ دەکرێ لە لایەن خواوە، واتۆ سکت پڕ دەبێ و منداڵێکت دەبێ و ناوی دەنێی یسوع، وە منداڵێکی زۆر بەرێز و حورمەتە کوڕی خوایە وە خوا کورسی مەلیکایەتی داودی پێ دەبەخشێ، وە دەبێتە خاوەنی ماڵی یعقوب مەلیکایەتیەکەی کۆتایی نایە، مەریەمە ووتی شتی وا چۆن دەبێ و من هیچ پیاوێك ناناسم واتە مێردم نیە، جبریل ووتی ( روح القدس) ی خوا دادەبەزێتە سەرت و هێز و توانای خوا دات دەپۆشێت هەر لەبەر ئەوشە ئەو منداڵە پیرۆزە ناری دەنرێ و**

بانگی دەکرێ بەکوڕی خوا وە بەسابابەتی پلەکی تۆ بەپیری خوا منداڵی دایێ و ئەوە مانگی شەشەمە لە حەملی ئەو. چونکە هیچ شتێك لای خوا زەحمەت نییە. جا مریەم ووتی وا من بووم بە ( امــة ) جاریەی خوا و باقسەکەت بێتە جێ ئەوجا جبرائیل ڕۆیشت.

**چەند تێبینیەك:**

١. ئـەم ئایەتانـەی ئینجیلـی لوقـا زۆریـەی لەگـەڵ قورئـانی پـیرۆزدا یـەك دەگرێتەوە تەنها هەندێکی نەبێ. لوقا دەڵێ (ابن العلی) (المولود منك يدعى ابن الله ) (ويعطيه الا اله كرسى داود ابيه ) ئەمە تـەنها لوقـا نوسـیویەتی بۆ گەورەیی عیسا بەڵام عیسا پێویستی بەم هەڵبەستەیە نییە. چونکە خـوای گـەورە خـۆی ڕێـزی لێ نـاوە و عیسـا ﷺ کـوڕی خـوا نییـە. هەروەکو لەمەودوا باسی دەکەین . انشاء ا لله.

٢. دەربارەی (ويعطية الاله كرسي داود ابيه) عیسا ﷺ لە نەتەوەی (یواقیم) بـوە و نـاکرێ لەسـەر کورسـی داود دابنیشـێ چونکـە لـەو کاتـەی ئـەو کاغەزەی (صحیفە)ی (بارخ) نوسی لەسەر زمانی (ارمیاء) ﷺ سوتێنرا خوا وەحی بۆ ارمیاء نارد (آية ٣٠ ص٣٦) لە کتاب ارمیاء (هكذا يقول الرب من يواقيم ملك يهوذا لايكون منه جالس على كرسى داود).

## جبریل یوسف النجار ئاگادار دەکاتەوە

جبریل یوسـف النجاری ئاگادار کردەوە بەوەی کە مەریەمـە سـکی بـوە (حەملی هەیە) بەڵام پاك و بێگەردە و زینای نەکردوە.

مەریەمە دەیزانی ویستی خوا لەسەر ئەوەیە کەخوا کوڕێکی بداتێ بیکات بە پێغەمبەر بەڵام چۆن قەومەکە تێبگات ... لەوانەیە بەردە بارانی بکەن وە دەستگیرانی (یوسف النجار)ە کە پیاوێکی ئاین پەروەرە و لەسەر دینی موسایە و خواپەرستە و لەخوا ترسە. بەڵام لێرەدا بە گوێرەی ئینجیل جبریل دەچێتە خەونی یوسف و لەو کاتەی کە یوسف دەیەوێت دەست لە مەریەمە بکێشێتەوە چونکە سك پڕە و دیارە زینای کردوە، پێی ووت تۆ لێی مەترسە و هەر دەست گیرانی تۆیە. جا کە یوسف بەئاگا هات و سوپاسی خوای گەورەی کرد و تەواوی تەمەنی خۆی لەگەڵدا بردە سەر.

## ئینجیل دەڵێ مەریەمە لە بیت لەحم منداڵی بوو

لەو سەردەمەدا مەلیك بڕیاری دا سەرژمێرێك بکات و هەرکەسە و بچێتە ئەو شوێنەی کە باب و باپیری لێبونە و خۆی لەوێ لە دایك بووە. جا یوسف النجار و مەریەمە چونە بیت لەحم بۆ ئەم کارە لەوێش مەریەمە منداڵەکەی بوو ئەمە لەسەر قسەی ئینجیلەکان.

## لەدایك بوونی عیسا ﷺ لە ئینجیلی بەرنابا

(١) لقد بعث الله في هذه الأيام الأخيرة بالملاك جبريل الى عذراء تدعى مريم من نسل داود سبط يهوذا (٢) بينما كانت هذه العذراء العائشة بكل طهر بدون أدنى ذنب، المنزهة عن اللوم، المثابرة على الصلاة والصوم.يوما ما وحدها و اذا بالملاك جبريل قد دخل مخدعها وسلم عليها قائلاً (ليكن الله

معك يامريم (٣) فارتاعت العذراء من ظهور الملاك(٤) ولكن الملاك سكن روعها قائلا لاتخافي يامريم لانك قد نلت نعمة من لدن الله الذي اختارك لتكوني ام نبي يبعثه الى شعب اسرائيل ليسلكوا شرائعه باخلاص (٥) فاجابت العذراء وكيف الد بنين و انا لا أعرف رجلا(٦) فاجاب الملاك يامريم ان الله الذي صنع الانسان من غير انسان لقادر على ان يخلق فيك انسان من غير انسان لانه لامحال عنده (٧) فأجابت مريم اني لعالمة ان الله قدير فلتكن مشيئته(٨) فقال الملاك كوني حاملا بالنبي الذي ستدعينه يسوع (٩) فامنعيه الخمر والمسكر وكل لحم نجس لان الطفل قدوس الله (١٠) فانحنت مريم بضعة قائلة ها انا ذا امة الله فليكن بحسب كلمتك (١١) واتة: خواى گەورە لەو رۆژانەی دوایدا فریشتەیەکی نارد بۆ لای مەریەمە کە (جبرائیل)ە. لە کاتێکدا کە ئەم ئافرەتە پاك و بێ تاوانە لە ژووری خۆی بەندایەتی خوای گەورەی دەکرد وە بەردەوام بوو لە نوێژ کردن و رۆژوو گرتن جا لەو کاتە ناسکەدا جبرائیل ﷺ چووە ژوورەکەی و سەلامی لێ کرد و ووتی خوای گەورە لەگەڵ تۆیە ئەی مەریەم، مەریەمە ترسا و لە دڵی خۆیدا ووتی دەبێ ئەم پیاوە کێ بێت هاتبێتە ژووری من لە کاتێکدا دەرگای ژوورەکە داخراوە بەڵام فریشتە ترسەکەی لابرد و ووتی ئەی مەریەمە تۆ مەترسە و نیعمەتت لەلایەن خواوە بۆ هاتووە چونکە خوای گەورە تۆی هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی ببیتە دایکی پێغەمبەرێکی خۆشەویست کە ڕەوانی دەکات بۆ گەلی ئیسرائیل بۆ ئەوەی ڕێ ڕۆنیان بکات بۆ بەندایەتی کردنی خوای گەورە بە دڵسۆزی مەریەمە وەلامی دایەوە جا چۆن من منالم دەبێت کە مێردم نەکردبێت. فریشتە ولامی دایەوە ووتی ئەو خوایەی مرۆڤی دروست کرد بەبێ مرۆڤ

واتە بەبێ دایك و باوك کە حەزرەتی ئادەمە ﷺ چۆن ناتوانێ مرۆڤێك لە تۆ دروست بکات بەبێ باوك لە کاتێکدا هیچ کارێك لە دەسەڵاتی خوا دەرناچێت. مەریەمە وەڵامی دایەوە ووتی من ئەزانم خوای گەورە توانای هەیە و با ویستی خوا بێتە جێ. فریشتە ووتی دەبا تۆ سك پڕ بیت بە پێغەمبەرێك کە ناوی دەنێیت (یسوع). جا ئەو منداڵە بپارێزە و بیڕە و شتی سەرخۆشکەری دەرخوارد نەدەیت و گۆشتی پیس واتە گۆشتی سەگ و بەراز و مردار بوو دەرخواردی ئەم منداڵە نەدەیت چونکە ئەو منداڵە زۆر پیرۆزە لە لای خوا جا مەریەمە خۆی لار کردەوە و ووتی من جاریەی خودامە و با قسەکەت بێتە جێ.

جا لێرەدا هەر قسەی بەرنابا لوقا بەدرۆ دەخاتەوە کە دەڵێ: ابن العلی: بەرنابا دەڵێ: ئەو خوایەی توانی مرۆڤێك دوروست بکات بەبێ مرۆڤ کە باوکی مرۆڤایەتی حەزرەتی (ئادەم)ە دەشتوانی مرۆڤێك لە تۆ دوروست بکات بەبێ باوك واتە پەیوەندی نێر و مێ. بەڵێ بەرنابا زۆر راستی تری درکاندوە هەروەکو مژدەی داوە بە هاتنی پێغەمبەرێك لەدوای عیسا ﷺ کە لە ئینجیلەکەیدا ناوی دەبات بە (بیری کلتوس) شێخ عبدالوهاب النجار دەڵێ: رۆژێکیان لە زانایەکی مەسیحی بەناوی (کارلونلینو)م پرسی ئایا مانای (بیری کلتوس) چیە ؟ -کە تۆ شەهادەی دکتورات هەیە لە زمانی یونانی کۆن- لە وەڵامدا ووتی مانای ووشەی (بیری کلتوس) بەزمانی عەرەبی: (الذي له حمد كثير) واتە (احمد) کە یەکێکە لە ناوەکانی پێغەمبەر ﷺ کە ناوی (محمد و احمد و طـه و یس) و هتد. بەڵام کلێسای جیهانی ئەم

ئینجیلەی بزرکردوە و نایەڵێ هیچ مەسیحیەك بیخوێنێتەوە نەوەك باوەڕی پێبهێنن.

## ئەو ئەشکەوتەی راستی پێ نیشان دام[1]

ئەمە ناونیشانی ووتارێکی قەشە (عەقیلە) کە لە گۆڤاری (النور) بلاویکردۆتەوە و باسی موسڵمان بوونی خۆی دەگێڕێتەوە. کە لە کاتێکدا قەشە عەقیل لە شاری بەغدا خوێندنی خۆی تەواو دەکات تا دەگاتە پلەی (قەشە) وە زانیارییەکی زۆری پەیدا کردوە دەربارەی شایێنی مەسیحی پاشان هەروەکو خۆی دەیگێڕێتەوە دەگوازرێتەوە بۆ کەنیسەی کاثولیك لە شاری نەینەوا لە قەد پاڵی چیای مەقلوب کە ئەم کەنیسەیە ژوری تری لە راهب و عابدەکانی مەسیحی لێ بوو وە لە ناو کەنیسەکەدا دەرگایەك هەبوو کە تێیدا دەچوونە ژوری ئەشکەوتێکی گەورە بەلام ئەم دەرگایە دەرگەوانێکی ئافرەتی هەبوو بە ناوی (ایزابیلا) کە ئەو ئافرەتە نەی دەهێشت هیچ کەسێك بچێتە ژووری ئەم ئەشکەوتە. بەلام من زۆر داوام لێ کرد کە ئەم کلیلەیەم بداتێ بۆ ئەوەی بچمە ژووری ئەشکەوتەکە. ایزابیلاش دەی گووت هەرکەسێك چەندین ساڵ بەر لە ئێستا چوبێتە ژووری ئەم ئەشکەوتە نەهاتۆتە دەرەوە. بەلام من پێم ووت ئەبێ کلیلەکەم بدەیتێ و خۆم بەرپرسیاردەبم لە هەر شتێك کە بەسەرم بێت لە ئەشکەوتەکەدا. ئەوجا کلیلەکەی دامێ و چوومە ژووری ئەشکەوتەکە دوای ئەوەی بە تەواوی خۆم

---

١ گۆڤاری النور ژمارە (٧٩) سەعدا تشرینی دووەم ١٩٩٧

ئامادە کردبوو خواردەمەنی چاکم پێ بوو بۆ چەند ڕۆژێك وە نیشانەی زۆرم پێ بوو بۆ ئەوەی لە کاتی گەڕانەوەمدا ڕێگا بزر نەکەم، جا کە چوومە ژوورەوە دوای چەند ڕۆژێك کە ئەم دەزانی ژمارەیان چەندە گەیشتمە دەرگایەکی گەورە و زۆر بەهێز پاڵم پێوەنا و کردمەوە بینیم لە ژوورەوە ئێسکی چەند مرۆڤێکی لێ بوو لەسەر و قاچ و ئێسقانەکانی تر لەشم لەرزیو زۆر ترسام بەلاّم لێرەدا قسەی (ازیابیللا)م بە بیر هاتەوە کە ووتی چەندین ساڵ بەو لە ئێستا چەند کەسانێك چوونەتە ژووری ئەم ئەشکەوتە و نەهاتوونەتە دەرەوە ئەوجا هانی خۆم دا و -سوپاس بۆ خوا- چوومە ژوورەوە و بەترسەوە لە کاتێکدا چاوم کەوت بە چەند پەرتووکێك کە تۆزی زۆریان لەسەر کەوتبوو بە دەست هەندێك لە تۆزەکەم لابرد و زۆر شتم لێی خوێندەوە کە بە زمانی سریانی کۆن نوسرابوو کە زۆربەی وەسیەتەکانی حەزرەتی عیسای ﷺ تێدا بوو کە یەکێك لەم وەسیەتانە ئەوە بوو: باوەڕ بهێنن بە پێغەمبەرێك کە لە دوای من دێت ناوی (محمد)ە ﷺ و ئارەق (خمر) ناخواتەوە و زینا ناکات و گۆشتی بەراز ناخوات و ...هتد، وتێیدا هاتبوو کە ئەم پێغەمبەرە بێ دایك و باوکە و نیشانەیەکی لەسەر شان هەیە -بەلاّم لە بیرم نیە نیشانەکە لەسەر کام شانە- بەلاّم ئەوەم لە بیرە کە نیشانەکە بە قەد هێلکەی کۆترێکە. وە لەناو ئەم پەرتووکانەدا ئینجیلی بەرنابام دۆزیەوە لەگەڵ وەسیەتەکانی تر هەڵم گرتن و هاتمە دەرەوە. کە ڕاهب و عابیدەکان منیان بینی سەریان سوڕما ... چۆن توانیت بیێتە دەرەوە؟ وە لەبەر ئەوەی شتەکەیان زۆر پێ سەیر بوو دەستیان کرد بە گریان، پاشان ووتیان ئەمە چیە پێتە؟ ووتم ئەمە وەسیەتەکانی عیسا ﷺ

و ئینجیلی بەرنابایە کە سەیریان کرد ووتیان ئەمە ئاشکرا مەکەن چونکە هیچ کەسێك ئەم شتانەی نەبینووە وە ئینجیلەکە و وەسیەتەکانیان لێسەندم و نەیانهێشت خەڵك بیبینێت. دوای ئەوەی دڵنیا بوون کە من ناڕۆم ڕۆژێکیان سواری سەیارەیەك بووم و بەرەو بەغدا بەڕێ کەوتم پاشان بەرەو وولاتی ئەردەن و پاشانیش بەرەو وولاتی یەمەن. سوپاس بۆ خوای گەورە کە ڕاستیم دۆزیەوە و هاتمە ناو ئاینی ئیسلام.

## گۆشتی سەگ و بەراز و خواردنەوەی مەی لە شەریعەتی مەسیحی قەدەغەیە

بەڵێ بەرنابا دەڵێ جبرائیل بە مەریەمەی ووت گۆشتی سەگ و بەراز و بیرە دەرخواردی منداڵەکەت نەدەی کەواتە بە گوێرەی ئەم ئینجیلە ئەم شتانەی سەرەوە لە شەریعەتی مەسیحیدا حەرامن بەڵام کە ئێستا مەسیحیەکان گۆشتی بەراز دەخۆن یا گۆشتی سەگ یابیرە خواردنەوە بە حەلاڵ دەزانن ئەوە گۆڕانکاریە بەسەر ئاینەکەدا هاتوە لەلایەن دەسەڵاتدارانی کلێسا.

## سەیر نیە کچ بە بێ مێرد منداڵی ببێ[1]

لەبەر ئەوەی ئەم ڕوداوەی حەزرەتی مەریەمە لە لایەن زۆر کەس بە سەیر دانراوە خوای گەورە لە سەدەی بیستەمدا ڕوداوێکی لەم چەشنەی پێ

1 ڕۆژنامەی (الاهرام) قاهیرە ٢٤/مایو/١٩٣٩.

نیشاندابن. ئەوە بو لە ١٤ مایو لە ساڵی ١٩٣٩ لە لیمای پایتەختی پیرۆ لە ئەمەریکای خواروو کچێك بەناوی (لینا مدینا) کە لە هیندە سورەکانە لە تەمەنی (٥) ساڵیدا منداڵێکی بووە کە وەزنەکەی (پێنج رطـل) بووو وە تەندورستی هەردوکیان زۆرباشە.

## مەریەمە تەنها بە فووی فریشتە سکی پڕ بوو

بەڵێ مەریەمە تەنها بە فووی (هەناسەی) فریشتە سکی پڕ بوو جا ئەم فوکردنە لە چ ئەندامێکی لەشی مەریەمە بوو گرنگ نیە. وە ئەم باسە لە قورئانی پیرۆز و فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ نەکراوە. ئیمامی بیضاوی دەڵێ ماوەی سك پڕی مەریەمە بە عیسا ﷺ (٧) حەوت مانگ بووە. بەلام هەندێ لە زانایان دەڵێن شەش مانگ و چەند رۆژێك بووە. جا سك پڕ بوونی مەریەمە بە هەناسەی فریشتە نیشانەی هێز و توانایی خوای گەورەیە وە بەڵگەیە لەسەر کاربەجێی خوای گەورە. هەر وەکو چۆن خوای گەورە ئادەمی دوروست کرد لە گڵ بە بێ دایك و باوك حەزرەتی عیساشی دروست کرد لە تەنها دایك بەبێ‌باوك هەر وەکو خوای گەورە لە قورئاندا فەرمویەتی ﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴾ آل عمران ٥٩ جا کە خوای گەورە بتوانێ ئادەمێك دروست بکات لە گڵ بە بێ دایك و باوك چۆن ناتوانێت عیسا دروست بکات لە دایکێك بەبێ باوك وە هەر وەکو بەرنابا لە ئینجیلەکەی‌دا دەڵێ: مەلاك جبریل بە مەریەمەی ووت ئەو خوایەی ئادەمی دروست کرد بەبێ دایك و

باوك دەتوانێ لەتۆشدا منداڵێك دروست بكات بەبێ باوك، وە دروست كردنی منداڵێك بەبێ باوك سەیر تر نی یە لە دروست كردنی زەوی و مانگ و رۆژ و ئاسمانەكان و هەزاران ئەستێرە و كەهكەشانی تر بە بێ پایە و عمود ....!!!....

## كەواتە عیسا ﷺ كوڕی خوا نیە

عیسا ﷺ بەندەیەكە لە بەندەكانی خوا وە خوای گەورە لەگەڵ چەند بەندەیەكیتر كە ژمارەیان ١٢٤٠٠٠ سەد و بیست و چوار هەزارە هەڵی بژاردون بەسەر خەڵكیتردا وە ناوی ناون پێغەمبەران واتە (پەیام بەر) كە بەزمانی عەرەبی (النبي) واتە ئاگادار كەرەوە یان (الرسول) واتە قاسید و رەوانەكراو بۆ ناساندنی خوای گەورە بە مرۆڤایەتی و ڕێ نیشاندانی خەڵك بۆ رێگای راست وخوا پەرستی. جا ئەو خوایەی كە ئەم پەیامبەرانەی هەناردون بۆ مرۆڤایەتی نە ژنی هەیە و نە كوڕی هەیە نە كچی هەیە بەڵكو ئەگەر بێت و نێر و مێیەتی یان كوڕ و كچ و خێزان بدرێتە پاڵ ئەو ئەوا سەردەكێشێ بۆ كافر بون و لەرێ دەرچون چونكە ئەگەر یەكێك ئەم شتانەی هەبو ئەوا دەبێ پێویستی بە كەسانێكی تر هەبێت بۆ جێبەجێ كردنی كارەكانی كە ئەمەش دژایەتی هەیە لەگەڵ ناوی خوایەتی چونكە خوایەك كە هەڵسوڕێنەری كار و باری زەوی و ئاسمانەكان بێت و رۆژانە هەزاران شت دروست بكات و دەیان كەس و هەزاران كەس بمرێنێ و رزق و رۆزی بۆ تەواوی دروستكراوەكان بە مرۆڤ و ئاژەل و باڵندە و ئاژەڵی كێوی و ماسی ناو بەحر و ... هتد دابین بكات چۆن دەبێت پێویستی بە ژن و

مێردایەتی و پەیوەندی جنسی و زاوزێ هەبێت ئەم شتانە دژایەتیان هەیە لەگەڵ سیفەتی (خالق) وە هەر وەکو خوای گەورە لە قورئاندا لە سورەتی (الاخلاص)دا دەفەرموێ ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ۞ اللَّهُ الصَّمَدُ ۞ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۞ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ ﴾ واتە تو بلێ خوا یەکە و تەنهایە و شەریکی نیە وە هەموو شتێك پێویستی بە ئەوە وە خوا پێویستی بە کەس و بە هیچ نیە وە زاوزێی نیە و ژن و کچ و کوری نیە و خویشی لە هیچ نێر و مێیەك پەیدا نەبووە و بەڵکو لە ئەزەلدا هەرهەبووە و هەریش دەمێنێ وە هیچ شتێکیش وەکو ئەو نییە. بەڵێ عیسا ﷺ خوا نییە و کوری خواش نییە بەڵام مەسیحیەکان دەڵێن: خوا پێك هاتوە لەسێ بەش: باوك - کور - روح القدس (جبرائیل) وە دەڵێن: بەشی باوك یا کور لە خوایەتی جیابویەوە و هاتە ناو منداڵدانی مەریەمە و منداڵێکی لێپەیدا بوو ئەو منداڵەش بەشێکی لە خوایەتی هەیە. وە ئەم قسەیە عیسا ﷺ ئەیکردوە و پێی رازی نیە. وە رازی نیە ناری ئەو لەگەڵ ناری خوا بێنن کە مەسیحیەکان دەڵێن (باسم الاب والابن وروح القدس) واتە (ثالوث) سێ‌خوا وە ئەم بیرو باوەرە لە کاتێکدا دروست بوو کە مەسیحیەکان دەیان ویست ئاینەکەیان لە ناو بت پەرستەکان ئەوانی دەڵێن خوا لاشەی هەیە و وە روحەکەی لە لاشەکەیەوە دەروا بۆ لاشەیەکی تر (تجسد) دەکات وە بروایان بەلە خاچ دان و خۆ بەفیداکردن هەبوو هاتنە ناو ئاینی مەسیحی ویستیان بیرو باوەرە کۆنەکەیان لەگەڵ ئاینە نوێیەکەی مەسیحی بگونجێنن هەر بۆ ئەم مەبەستە بیر و باوەری (ثالوث) دروست بوو ووتیان بەشێك لەخوایەکان: هەندێکیان

دەڵێن بەشی باوك و هەندێكیان دەڵێن بەشی كوڕ هاتە ناو منداڵانی مەریەمە و ... هتد.

بەڵام بەم بیر وباوەڕە خۆیان بردە ریزی بت پەرستەكان و شەریكیان بۆ خوا ئەنجام دا بەڵێ خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّهِ وَقَالَتِ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللَّهِ ذَلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَاهِهِمْ يُضَاهِئُونَ قَوْلَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَبْلُ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ ﴾ التوبة ٣٠. واتە جولەكەكان دەیان ووت عزیر كوڕی خوایە كە پێغەمبەرێكی بەنو ئیسرائیلیەكانە وە مەسیحیەكان دەیان گوت عیسا ﷺ كوڕی خوایە ئەمە قسەیەكە لە دەمیان دەدەرێنەوە و قسەی كافرەكانی پێش خۆیانە دەیڵێنەوە دوورن لەرەحمەتی خوا، خوابیان كوژێ چۆن لەحەق لادەدەن دوای ئاشكرابونی. وە لە سورەتی مەریەمدا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَدًا ۝ لَقَدْ جِئْتُمْ شَيْئًا إِدًّا ۝ تَكَادُ السَّمَوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ الْأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدًّا ۝ أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَنِ وَلَدًا ۝ وَمَا يَنبَغِي لِلرَّحْمَنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ۝ إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْدًا ﴾ مریم ٨٨-٩٣. واتە مەسیحیەكان و جولەكەكان كوڕیان بۆ خوا ئەنجام داوە بەراستی شتێكی خراپیان كردوە و بەدوای شتی بێرو و بوچ كەوتون، نزیكە ئاسمانەكان لەگەڵ ئەم قسەیە لەت لەت ببن و زەوی شەق ببێ و چیاكان بتوێنەوە چونكە تاوانێكی زۆر گەورەیە كە كوڕیان بۆ خوا ئەنجامداوە وە قەت نابێ خوا كوڕی هەبێت و پێویستی پێ نییە وە لە ڕۆژی دوایدا هەرچی لەناو ئاسمانەكان و زەویدا هەیە بە عیسا و عوزێر

تەواوی پێغەمبەرانەوە بە مل کەچی دێنە خزمەت خوای گەورە وە عیسا ﷵ خۆی وەڵامی خوای گەورە دەداتەوە کە ئاگاداری ئەم باس و خواسە نیە وە ئەوان لەخۆیانەوە ئەم کارەیان ئەنجامداوە هەروەکو لەقورئاندا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَهَيْنِ مِن دُونِ اللَّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِن كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ ﴾ المائدة ١١٦.

واتە خوای گەورە فەرمووی ئەی عیسای کوڕی مەریەمە ئایا تۆ فەرمانت بە ئوممەتەکەت کردوە و پێت ڕاگەیاندن کە من و دایکم بپەرستن جگە لەخوا .... عیسا ﷵ وەڵامی دایەوە و ووتی: خوایەگیان پاکی و گەورەی هەر بۆ تۆیە من بۆم نی یە قسەیەك بکەم کە لە ئاستی من نەبێت وە ئەوەی من ووتومە تۆ باشتر ئەیزانی ئاگاداری ناو دڵی منی و قسە پەنهانەکانی من دەزانی بەڵام من قسە پەنهانەکانی تۆ نازانم و تۆ خوایەکی زانا و دانای. کەواتە بۆمان دەردەکەوێت کە عیسا کوڕی خوا نیە بەڵکو بەندەیەکە لە بەندەکانی خوای گەورە.

## مەریەمە و دانانی منداڵ لە قورئانی پیرۆز

لە سورەتی مەریەمدا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِ مَكَانًا قَصِيًّا ﴾ واتە مەریەمە منداڵەکەی لەناو سکدا هەڵگرت و ڕۆیشت تا وای لێ هات بچێتە جێگایەکی بزر لە پێش چاوی خەڵك. ئیمامی بەیضاوی

دەڵێ کاتەکە زستان بوو جێگایەکەش هەموی داری خورمای لێبوو، خۆ دارخورماکان وشك بوون بەڵام چونی بۆ ئەوێ تەنها بۆ خۆ شاردنەوە بوو. ﴿ فَأَجَاءَهَا الْمَخَاضُ إِلَى جِذْعِ النَّخْلَةِ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا ﴾ واتە ژانی منداڵ بوون وای لە مەریەمە کرد بچێتە ژێر دارخورمایەك بەڵام مەریەمە ئەوەندە غەمناك بوو وە دەترسا لە لۆمەی خەڵکەکە، دوعای کرد و خۆزگەی خواست کە زۆر پێش ئێستا بمردمایە و لە بیری خەڵکی بچومایەوە بەڵام خوای گەورە دڵی مەریەمەی ئارام کرد و بانگەوازێك کرا. زانایان لێرەدا دو رای جیاوازیان هەیە هەندێکیان دەڵێن بانگەوازکارەکە جبریل بوو ﷺ وە هەندێکیان دەڵێن عیسا بوو ﷺ جا هەر یەکێکیان بێت گرنگ نیە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَنَادَاهَا مِن تَحْتِهَا أَلَّا تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا[1] ﴾.

واتە بانگی مەریەمەی کرد لە ژێرەوە، لەبەر ئەوەی وتی لە ژێرەوە بانگەوازەکە کرا وا پێدەچێ حەزرەتی عیسا بوو بێ ﷺ وتی: ئەی مەریەمە غەم مەخۆ خوای گەورە جۆگەیەکی ئاوی سازگاری هەڵقوڵاندوە هەر لەژێر خۆتە ئاوی لێ بخۆرەوە. ﴿ وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا ﴾. واتە: هەر هەمان بانگەوازکەر بە مەریەمەی وت لقی ئەم دارخورما وشك بوە بۆ خۆت رابکێشە خورمای زۆر خوش و بەتام بەسەر تۆدا دەباریێ کە ئەمەش کەرامەتێکە بۆ مەریەمە وە لە هەمان کاتدا دڵدانەوەیە بۆ

---

[1] هەندێ لە زانایان دەڵێن ووشەی (سريا) واتە منداڵێکی بە شورەت و ناوبانگ و پایە بەرز

مەریەمە کە بەم کاتە سارد و زستانە خورما بە دارەوە بێ شتێکی زۆر گرنگە واتە ئەو خوایەی بەم کاتە خورما بەرهەم دەهێنێ و ئاو لەزەوی وشک هەڵدەقوڵێنێ منیش لە بیر ناکات و دەمپارێزێ وە مەریەمە هەر لەمنداڵیەوە کەرامەتی نواندبوو وە سەلماندبووی کە دۆست (وەلی) خوایە. ﴿ فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا ﴾ واتە: بانگەوازکارەکە ووتی: مەریەمە تۆ خورمایەکە بخۆ و ئاوەکە بخۆ وە غەم مەخۆ و دڵت ئارام بێت ﴿ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنْسِيًّا ﴾ واتە ئەگەر لە گەڕانەوە کەسێکت بینی و پرسیاری لێکردی دەربارەی ئەم منداڵە تۆ قسە مەکە و بڵێ من بەڕۆژووم واتە بە ئیشارەت بڵێ من بەڕۆژووم چونکە ئەو کات بەنو ئیسرائیلەکان ئەگەر بەڕۆژوو بونایە قسەکردنیش حەرام بوو تا ڕۆژووەکەیان دەشکاند یا ڕۆژوویان هەبو تەنها لە قسەکردن، جا مەریەمە سەری دار خورماکەی ڕاکێشاو خورمای پێوە هات و خورمای خوارد و ئاوی خواردەوە و بە بێ ئەزیەت منداڵەکەی دانا.

لێرەدا دەبێ مەریەمە بچێتە ماڵەوە وە چۆن دەبێ لەم چۆلگەیە بمێنێتەوە بەڵام ئەم خەڵکە چی پێدەڵێن کە منداڵی ساوای لە باوەش ببینن، بەڵام پشتی بەوە قایم بوو کە خوای گەورە دەیپارێزێ عەیبەکەی دادەپۆشێ هەرچەندە هیچ عەیبێك لەم کارەدا نەبوو بەڵام بە لای خەڵکەوە شتێکی سەیر بوو تا تێدەگەیشتن.

مەریەمە هەڵسا خۆی و کۆرپەکەی برد و شاری ناصرە کەوتە رێ لەناو شاردا گەیشتە خەڵکەکە و دەوریان لێدا ﴿ فَأَتَتْ بِهِ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُ قَالُوا يَا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئًا فَرِيًّا ﴾. واتە: مەریەمە کۆرپەکەی هەڵگرت و چووە ناو خزم و کەسەکانی دەوریان لێداو ووتیان ئەی مەریەمە بەراستی کارێکی نارەوات ئەنجامداوە. ﴿ يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا ﴾. واتە: ئەی خوشکی هارون باوکت پیاوێکی خراپەکار نەبوو دایکیشت ئیشی نارەوا و زینای نەدەکرد. مەریەمە لێرەدا کەوتە ئەمرێکی واقیع. هیچ قسەی نەکرد و واتە من بەرۆژووم. بەڵام دەستی بۆ کۆرپەکەی درێژکرد واتە با ئەو منداڵە وەڵامتان بداتەوە. ﴿ فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ قَالُوا كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي الْمَهْدِ صَبِيًّا ﴾ مەریەمە پەنجەی بۆ عیسا ﷺ درێژ کرد واتە با ئەو کۆرپەیە وەڵامتان بداتەوە، ئەوانیش سەریان سوڕما و چۆن دەبێ ئەو منداڵە تازە لەدایك بووە قسەبکات، ووتیان چۆن گفتوگۆ لەگەڵ منداڵی ناو بێشکە (لانك) بکەین، چونکە هیچ کات و ساتێك ئەم جۆرە منداڵە هیچ قسەی نەکردوە لێرەدا موعجیزەیەك بۆ حەزرەتی عیسا ﷺ روویدا، چونکە یەکسەر دەستی کرد بە گفتوگۆ و ووتی: ﴿ قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا ﴾ ووتی من بەندە و عەبدی خوام، خوای گەورە کتابی ئینجیلم بۆ دەنێرێ وە دەمکاتە پێغەمبەر و رەوانم دەکات بۆ لای ئێوە ﴿ وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ

حَيًّا ﴾ وه دهمگێڕیٚ به مرۆڤێکی پیرۆز و مبارك له هەر كوێیەك بم وه فەرمانم پیٚ دهکات به نوێژ کردن و بەندایەتی کردن و زەکات دان و یارمەتی دانی هەژاران و نەداران هەتاکو زیندو بم. ﴿ وَبَرًّا بِوَالِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا ﴾ وه فەرمانم پیٚ دهکات لهگهڵ دایکم چاك بم و چاکەی لهگهڵ بکەم و منی نەکردوه به پیاوێکی ستەم کار و خراپ جا لێرەدا عیسا ﷺ که له باوەشی دایکی. دوای چەند ساتێك له دایك بوون دهستی کرد به قسه کردن وه یەکێك له ووتەکانی ئەوه بوو. ووتی: (وَبَرًّا بِوَالِدَتِي) واته چاکه لهگهڵ دایکم بکەم. هەموو پێغەمبەرەکانی تر دهیان ووت (وَبَرًّا بِوَالِدَيَّ ) واته چاکه لهگهڵ دایك و باوکم بکەم. تەنها پێغەمبەری ئێمه ﷺ نەبیٚ چونکه ئەو لەناو سکی دایکی بووه که باوکی وەفاتی کردوه وه تەمەنیشی شەش ساڵان بوو که دایکی مردوه. وه خوای گەوره دهربارەی ئەو فەرموویەتی: ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ ﴾ وه پێغەمبەر ﷺ دەی فەرموو (ارسلني الله رحمة للعالمين) وه عیساش ﷺ فەرمووی چاکه لهگهڵ دایکم بکەم چونکه باوکی نەبووه و له دایك بونی ئەو خۆی موعجیزەیەك بوو. ئەو هەر لەو کاتەش بو به پێغەمبەر لەسەر ڕای هەندیٚ له زانایان. کەواته قسەی ئینجیلەکان ڕاست نییه که باسی لیٚ دهکەین له دوای ئەم باسه انشاء الله. که دهڵیٚ: (لان الذى حبل فيها من الروح القدس ) ڕاسته له (روح القدس)ە بەڵام روح القدس فریشتەیه تەنها بەفوکردن له سەری کراسی مەریەمه حەملی پیٚدا بەفەرمانی خوا. ﴿ وَالسَّلَامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدْتُ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ

﴿ حَيّاً ﴾ واته ڕەحمەت و سەلامی خوا لەسەر من بێ لە ڕۆژی لەدایك بوونم و لەڕۆژی مردنم وە لە ڕۆژی زیندوبوونەوەم. لێرەدا گفتوگۆی عیسا ﷺ کۆتای هات و بەنو ئیسرائیلییەکان بوون بە دوو بەش، هەندێکیان ووتیان ئەمە کوڕی خوایە، ئەگەر نا چۆن دەبێ منالێ تازە لە دایك بووبێ و قسە بکات، وە هەندێکیان ووتیان ئەمە سیحرە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ الْحَقِّ الَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴾ واته ئەمەیە عیسای کوڕی مریم کە ڕاستە و ئەواوە بەلام ئەوان شك و گومانیان پەیدا کرد کە هەندێکیان ووتیان کوڕی خوایە هەندێکیان ووتیان سیحرە. ﴿ مَا كَانَ لِلَّهِ أَنْ يَتَّخِذَ مِنْ وَلَدٍ سُبْحَانَهُ إِذَا قَضَىٰ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ ﴾ واته قسەی ئەوان ڕاست نییە و خوای گەورە هیچ کوڕی نییە و زۆر گەورەترە و بەرزترە لەوەی ئەم سیفەتانەی بۆ ئەنجام بدەن. چونکە ئەگەر کوڕی هەبێ دەبێت ژنیشی هەبێ خوای گەورەش ئەم شتانەی هیچ نییە.

﴿ فَاخْتَلَفَ الْأَحْزَابُ مِنْ بَيْنِهِمْ فَوَيْلٌ لِلَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ مَشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴾ واتە جیاوازی و تەفرەقەیان کەوتە نێوان هەروەکو گوتمان هەندێکیان ووتیان سیحرە و هەندێکی تر ووتیان کوڕی خوایە. جا سزای توند بۆ کافرەکان لە ڕۆژی دوایی.

## ئەوانەی لەبێشکەدا قسەیان کردوە

عن ابي هريرة ﷺ عن النبي ﷺ قال: (لم يتكلم في المهد الا عيسى و كان رجل من بني اسرائيل يقال له جريج كان يصلي فجاءته امه فدعته فقال اجيبها او اصلي؟!!!! فقالت اللهم لا تمته حتى تريه وجوه المومسات و كان جريج في صومعته فتعرّضت له امرأة فكلمته فأبى فأتت راعياً فأمكنته من نفسها فولدت غلاماً فقالت من جريج فأتوه فكسّروا صومعته وانزلوه وسبّوه فتوضأ وصلّى ثم اتى الغلام فقال: من ابوك يا غلام؟ فقال الراعي، فقالوا انبني صومعتك من ذهب؟ قال: لا الا من طين. و كانت امرأة ترضع ابنها من بني اسرائيل فمرّ بها رجل راكب ذو شارة فقالت اللهم اجعل ابني مثله فترك ثديها وأقبل على الراكب وقال اللهم لا تجعلني مثله ثم اقبل على ثديها يمصه. قال ابو هريرة: كأني انظر الى النبي ﷺ يمص اصبعه. ثم مُرَّ بأَمَة فقالت اللهم لا تجعل ابني مثل هذه فترك ثديها فقال: اللهم اجعلني مثلها فقالت له لم ذاك؟ فقال: الراكب جبار من الجبابرة وهذه يقولون لها سرقت زنت ولم تفعل) رواه البخاري واحمد.

واتە قسەیان نەکردوە لەناو بێشکەدا تەنها: عیسای کوری مەریەم نەبێت وە لە ناو بەنو ئیسرائیلیەکانیش پیاوێك هەبوو ناوی جورەیج بوو لە پەرستگاکەی کە لە پاڵ چیایەك دروستی کردبوو خواپەرستی دەکرد رۆژێکیان دایکی چووە لای و جورەیجیش نوێژی دەکرد هەرچەند دایکی قسەی کرد جورەیج نەیزانی چی بکات لە دڵی خۆیدا ووتی خوایە گیان نوێژەکەم بەتاڵکەم و وەڵامی دایکم بدەمەوە یا هەر بەردەوام بم لە نوێژەکەم پاشان جورەیج نوێژەکەی بەتاڵ نەکرد و دایکەکەشی لێی دڵگیر بوو دوعای

لێ کرد و دوعایەکەشی قەبول بوو ووتی: خوایە گیان ئەی مردنی تا دەم و چاوی بە دەم و چاوی ئافرەتێکی داوێن پیس دەکەوێت دوای چەند ڕۆژێك ئافرەتێك لە پەرستگاکەی جورەیج بەڕێوەر کەوت و داوای زینای لێ کرد بەڵام جورەیج وەڵامی ئافرەتەکەی نەدایەوە و ئافرەتەکەش لە ڕقان چوو زینای لەگەڵ شوانێك کرد و منداڵی پەیدا بوو ووتی ئەم منداڵە لە جورەیج پەیدا بووە، جا پیاوەکانی پاشا چوون پەرستگاکەیان ڕوخاند و جوێنیان بە جورەیج دا و هێنایان بۆ لای پاشا. ئەوجا جورەیج دەست نوێژێکی هەڵگرت و نوێژی کرد و چووە لای منداڵەکە کە لە باوەشی دایکی بوو پێی ووت ئەی منداڵ کێ باوکتە؟ منداڵەکە ووتی فلان شوانە ئەوجا پەشیمان بوونەوە و بە جورەیجیان ووت با پەرستگاکەت لە زێڕ بۆ دووەست بکەینەوە بەڵام ئەو داوای کرد کە لە گڵ و بەرد دروست بکرێتەوە. وە ئافرەتێك لەناو بەنو ئیسرائیلیەکان منداڵێکی شیر خۆری هەبوو ڕۆژێکیان شیری ئەدایە کورەکەی پیاوێکی سوارئەسپ بە لایاندا تێپەری زۆر ڕێك و پێك بوو ئافرەتەکە ووتی خوایە گیان کورەکەی منیش وەکو ئەم پیاوە لێ بکە منداڵەکەش دەمی لە مەمکی دایکی کردەوە و ڕوی کردە پیاوەکە و ووتی خوایەگیان وەکو ئەم پیاوەم لێ نەکەی هەر لەو کاتەدا ئافرەتێك بەلایاندا تێپەری و دایکی کورەکە ووتی خوایەگیان کورەکەی من وەکو ئەم ئافرەتە لێ نەکەی چــــونکە خەڵکی بەردە بارانی ئافرەتەکەیان دەکرد و جوێنیان پێ‌دەدا و بوختانیان پێ‌دەکرد کە زینای‌ کردوە و دزی کردوە منداڵەکەش ڕوی کردە ئافرەتەکە و ووتی خوایەگیان وەکو ئەم ئافرەتەم لێ بکە. دایکە ووتی بۆ؟ کورەکە ووتی ئەو پیاوەی تۆ دوعات کرد خوا وەکو

ئەوم لێ بکا پیاوێکی ستەم کار بوو ئامەویٚ خوا وەکو ئەوم لێ بکا بەڵام ئافرەتەکە هەژارە و خەڵکی بوختانی بۆ هەڵدەبەستێت دەڵێن دزی کردوە و زینای کردوە بە درۆ و راست نیە.

ئەم ووتە پیرۆزەی پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی خوای گەورە ئەوانی تری بۆ ئاشکرا بکات پاشان لە ووتەیەکی تری باسی دووکەسی تریش دەکات و باسی منداڵی باوەشی دایکی دوبارە ئاکاتەوە کە دەفەرموێ: (لم يتكلم في المهد الا عيسى وشاهد يوسف وصاحب جريج وابن ماشطة فرعون) رواه الحاكم بسند صحيح.

هەر چەندە ئیمامی سیوطی رەحمەتی خوای لەسەر بێت لە شیعرێکدا کۆیان دەکاتەوە بە چواردە کەس، کە دەڵێ:

| | |
|---|---|
| تكلم في المهد النبي محمد | ويحيى وعيسى والخليل ومريم |
| ومبري جريج ثم شاهد يوسف | وطفل لدى الاخدود يرويه مسلم |
| وطفل عليه مر بالامة التي | يقال لها تزني ولا تتكلم |
| وماشطة في عهد فرعون طفلها | ومي زمن الهادي المبارك يختم |
| وزد لهم نوحا يوسف بعده | ويتلوهم موسى الكليم المعظم |

هەر چەندە قسەی هەمووشیان نوسراوە لە پەرتوکە مێژوییەکان زانایان باسیان کردوە تەنها قسەی حەزرەتی یوسف نەبێت بەڵام لەبەر ئەوەی بە حەدیسی صحیح ئەم بینیوە تەنیا ئەو پێنجەی باسمان کردن باسی ئەوانی تر ناکەم.

## ( ختان ) سوننەت کردنی عیسا عليه السلام

لەو کاتەدا خەڵك لەسەر دینی یەهودی بوون لەلای ئەوانیش مندال سوننەت دەکرا. چونکە خوا فەرمانی بە ابراهیم عليه السلام کردبوو کە لەڕۆژی هەشتەم مندال سوننەت بکەن. هەرچەندە ئەم باسە لە قورئاندا باس نەکراوە بەلام لە ئینجیلی لوقا باسی دەکات و دەڵێ: آیـة (٢١) ص(٢) : (ولما تمت ثمانية ايام ليختنوا الصبي سمي (يسوع) كما تسمى من الملاك قبل ان حبل بـه في البطن).

انجیل بەرنابا آية ٢٤ ( فلما تمت الايام الثمانية حسب شريعة الـرب كمـا هو مكتوب في كتاب موسى أخذا الطفل واحتمـلاه الى الهيكل ليختنـاه (٢٥) فختنا الطفل وسمياه (يسوع) كما نسمى من الملاك قبل ان حبل في الرحم.

## ( مجوس ) و یسوع

لەچوار ئینجیلەکانی (متیٰ و مرقس لوقا و یوحنا)، تەنها متیٰ باسی کردوە و بەرناباش لە ئینجیلەکەی نووسیویەتی دەگێرنەوە کە مێکەسی مەجوسی لە رۆژهەلات ئەستێرەکەریان دەکرد و چاویان لە ئاسمان بوو. دبنیان ئەستێرەیەکی زۆر بە رووناکی دەرکەوت چونە لای یەهودیەکان ئەستێرەکەیان نیشان دان لە رێگادا گەیشتنە اورشلیم و پرسیاریان کرد. لە کوێ کوری مەلیکی یەهودیەکان لـە دایـك دەبێـت. هیرۆدۆسـی مەلیك گوێبیستی ئەم قسەیەبوو زۆر ترسا و بەدوای کاهن و سیحربازەکانی دا نارد و لێی پرسین لە کوێ مەسیح لە دایك دەبێت وتنیان لە بیت لەحم.

ئەوجا هیرۆدۆس بە دوای سێ پیاوە مەجوسی‌یەکانی‌دا نارد و لێی پرسین بۆچی هاتوون. ووتیان ئێمە ئەستێرەیەکمان لە رۆژهەلات دیت و رێگای ئێمەی خستە نێرە. وە ئەم سێ مەجوسی‌یە بەخشیش و هەدیەیان هێنابوو بۆ ئەم منالە کە (مەسیح)ە. هیرۆدۆسیش ووتی برۆن لە بیت لەحم منالەکە بێنن بۆ ئەوەی بیکوژێ. ئەوانیش چون بەخشیشەکانیان دایێ و سەجدە و کوڕنوشیان بۆ برد و نەویران بچنەوە لای هیرۆدۆس، چونکە ئەگەر بچونایە و منالەکەیان پێ‌بوایە دەیکوشت، هەر لەوێ گەرانەوە وولاتی خۆیان. وە هیردۆسیش بریاری‌دا هەموو منالێکی ئەم سالە لە دایك بووە دەبێ بکوژرێ. لوقا زۆر لەم باسەی کۆلیەوە بەلام هیچ راستی‌یەکی بۆ بەدیار نەکەوت. لەبەر ئەوە نەینوسیەوە. بەلام ئەم روداوە درۆیە و راستی پێوە دیارنی‌یە. چونکە مەجوسی‌یەکان خۆیان دان بە هیچ ئەهلی کتاب دانانێن. باوەریان بە خوا و بە پێغەمبەر و پەرتوکە ئاسمانی‌یەکان نی‌یە.

## یوسف و مریم و عیسا دەرۆن بۆ میسر

ئەم باسەش تەنها متێ نوسیویەتی لە چوار ئینجیلەکان و بەرناباش باسی کردوە.

دەڵێن لەو کاتەی کە هیردۆس فەرمانی دەرکرد کە هەموو منالێك لەم سالانە لە دایك بوبێت دەبێ بکوژرێت. لە بیت لەحم یوسفی نەجار لە خەودا فەرمانی پێکرا کە ئەم مندالە و دایکی ببات بۆ میسر بۆ ئەوەی لە دەستی پاشا پارێزراو بێ. ئەویش فەرمانەکەی بەجێ‌گەیاند و چوون بۆ میسر تاکو هیردۆس مرد. دوای مردنی هیردۆس لە خەودا فەرمان بە یوسف کرا کە

بگەڕێتەوە وڵاتی خۆیان، چونکە ئێستا ترس نی یە و کەس یسوع ناکوژێ، وە درێژەی ئەم باسە لە ئینجیلی بەرنابا لە سەرەتای بەندی (٦) تا کۆتایی بەندی(٨) باس کراوە. وە هەندێك لە زانایانی تەفسیری قورئان دەڵێن مەبەستی خوای گەورە لە ﴿ وَآوَيْنَاهُمَا إِلَى رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ ﴾ المؤمنون ٥٠ وڵاتی میسرە، وە مەسیحیەکانی میسر وا گومان دەبەن کە یوسف و مریم لەژێر دارێك حەسانەوە، لە شاری (عین شمس) وە دارەکەش پارێزراو بووە تا سەردەمێکی نزیك ناوی دارەکەش (شجرة العذراء)[1] بووە.

## یسوع گفتوگۆ لەگەڵ زانایان دەکات

دوای ئەوەی گەڕانەوە بۆ وڵاتی (فلسطین) لە ئینجلدا دەڵێ: لە کاتێکدا کە هیرۆدۆس مرد، جبریل چووە خەونی یوسف پێی وت بگەڕێوە بۆ یەهودیە وڵاتی خۆت چونکە ئەو کەسانەی کە دەیان ویست منداڵەکەت بکوژن نەماون و لەناو چوون. ئەوجا یوسف مریم و عیسای هێناوە بۆ وڵاتی یەهود و تەمەنی منداڵەکەش حەوت ساڵ بوو. وە زانیان کە ارخیلاوس کوڕی هیردۆس بووەتە مەلیك چونە جەلیل لە شاری ناصرە نیشتەجی‌بوون وە منداڵەکەیان پەروەردە کرد لە نێو خۆشی و حیکمەت و زانست لە پێش خوا و خەڵك. کاتێك تەمەنی یسوع گەیشتە دوانزە ساڵ یسوع لەگەڵ یوسف و مەریەم چونە اورشلیم، بۆ ئەوەی سجدە ببات و عیبادەت بکات بەگوێرەی ئاینی موسا. دوای نوێژ و عبادەت کردن ڕۆیشتن،

---

[1] کتابی (الفارق بین المخلوق والخالق) للباجەجی ج١ ص٢٩

بەڵام یسوع لە یوسف و مریم جیابوەوە و یوسف و مەریەمە وایان زانی لەگەڵ خزمەکانیان گەڕاوەتەوە ناصرە تا سێ ڕۆژ لە ڕۆژی سێیەم دیتیان یسوع لەلای هیکل لە نێو زانایان دانیشتوە و موناقەشەیان لەگەڵ دەکات ئەم زانایانە سەریان سوڕما بوو لەم منداڵە ژیر و زیرەك و زانایە. دایکی باوەشی لێدا و ووتی ئێمە زۆر بۆت غەمبار بووین...

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە عیسا پەروەردەیەکی جوان و پاك و بێگەردی کرابوو بەڵام ئینجیلەکان بێدەنگن لە ڕاست ژیانی عیسا لە تەمەنی دوانزە ساڵیەوە تا تەمەنی بیست و نۆ ساڵی. هەرچەندە هەندێکیان ئاماژە بەوە دەکەن کە لە شاری ناصرە دادەنیشت. بەڵام چۆن دەبێت پێغەمبەرێکی ئاوا پیرۆز و ناودار لە شارێك دابنیشێت و بانگی خەڵکی نەکات بۆ سەر ئاین و ڕاست کردنەوەی تاوانەکان. وە ئەورووپیەکان دەڵێن چووە هیند و ئاینی بوذی فێر بوو و ئیشی پێدەکرد. بەڵام ئەمەیان ڕاست نیە چونکە عیسا لەلایەن خواوە وەحی بۆ دەهات. چۆن ئاینی بوذی وەردەگرێت کە یەك تۆزقاڵ ڕاستی تیدا نیە.

## پێغەمبەرایەتی یسوع (عليه السلام)

لە قورئانی پیرۆز دا باسی ئەوە نەکراوە کە لە چ ساڵێك یسوع بوو بە پێغەمبەر بەڵام ئینجیلەکان دەڵێن: یوحنا المعمدان واتە (یەحیای کوڕی زەکەریا) لە چۆلگە پەیدا بوو ماوەیەك خواردنی هەنگوین و کوللە بوو وە جل و بەرگی لە کورکی ووشتر بوو. پاشان لە سنووری ئەردەن پەیدابوو ئاگاداری خەڵکی دەکردەوە کە تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە. جا خەڵکی اورشلیم

و سنورەکانی ئەوردەن چوونە لای و ئەویش بەو ئاوە دەی شوشتن و ئاگاداری دەکردنەوە کە ملکوت اللە نزیك بووە. وە کاهینەکان ناردیانە لای ئایا ئەوە ئیلیایە ووتی نەخێر ووتیان مەسیحە ووتی نەخێر ووتیان پێغەمبەرێکە ووتی نەخێر، ووتیان تۆ کێی؟ ووتی من دەنگی هاوارم لە چۆلگە بگەڕێنەوە سەر ڕێگای خوا. جا لێرەدا مەسیح چووە لای، وە جبریل لەسەر شێوەی کۆترێك چووە لای ئەوجا مەسیح نەگەڕایەوە تا چل ڕۆژ بەڕۆژوو بوو. لەو کاتەدا شەیتان چووە لای ... تا کۆتایی ئەم باسە. دەڵێن لەو کاتەدا تەمەنی مەسیح سی ساڵ بووە.

کە متی نوسیویەتی لە ص١، مرقس لە ص(٣، ٤)، لوقا لە ص١، و یوحنا.

## یسوع لە تەمەنی سی ساڵیدا لەسەر چیای زەیتون ئینجیلی بۆ هات

لە ئینجیلی بەرنابادا وا دەردەکەوێت کە عیسا ﷺ تەمەنی سی ساڵ بووە کە ئینجیلی بۆ هات. هەروەکو دەڵێ: (ولما بلغ یسوع ثلاثین سنة من العمر کما أخبرنی بذلك نفسه صعد الی جبل الزیتون مع امه لیجنی الزیتون).

## ئینجیل مانای چییە !

ئینجیل واتە مزگێنی (بشارة). وە شاهید هەیە کە خوای گەورە ئەم ئینجیلەی داپە عیسا پڕبوو لە هدایەت و ڕێ پیشاندان و چرای ڕووناکی بۆ خەڵك وە بەنی ئیسرائیلیەکانی دەترساند کە بگەڕێنەوە لای خوا و

بپەرستن. وە ئاگاداری کردنەوە کە روداوی زۆر لە مەودوا روو دەدات وە مزگێنی دانێ کە پێغەمبەرێکی تر دێت و شەریعەتێکی نوێ پەیدا دەکات کە (محمد ﷺ). ﴿ نَزَّلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنْزَلَ التَّوْرَاةَ وَالْإِنْجِيلَ ۝ مِنْ قَبْلُ هُدًى لِلنَّاسِ ﴾ آل عمران ٣ واتە ئەی محمد ﷺ خوای گەورە ئەم قورئانەی بۆ تۆ ناردوە بە راستی وە لە پێشدا تەورات و ئینجیلی رەوان کرد بۆ رێنیشاندەری خەڵكی وە (فرقان) واتە قورئانی نارد کە جیاوازی لە نێوان راستی و ناراستی دیار دەکات. بەڵام ئەم ئینجیلە بۆ عیسا هاتبوو ئێستا گۆرانکاری زۆری هاتۆتە سەر و ژمارەیان لە سەد تێپەریوە هەر کەسێك بە گوێرەی زانینی خۆی نوسیویەتی. هەروەکو دەگێرنەوە کە پاشای ئەو سەردەم -بە هۆی (بولص)ەوە کە بەرێوەبەری بەندیخانە بوو- قوتابیەکانی مەسیحی هەموویانی گرتن و بەندی کردن تا ماوەیەکی زۆر وە زۆر ئازاری دان وە هەندێکیان مردن لەبەر ئازاری توند. دوای دەرچوونی ئەوانی تر لە بەندیخانە ئینجیلیان لە بیر چووبوو بەڵام بەگوێرەی زانستی خۆیان هەریەکە بە شێوەیەك نوسیەوە.

## مانای مەسیح

لە زمانی عیبریدا: مەسیح بە پێغەمبەر و مەلیك دەگوترێ وە مەبەست ئەوە نیە کە مەسیح دەبێتە مەلیکی بەنو ئیسرائیلیەکان بەڵکو هەروەکو ناوێك چۆن زۆر کەس ناوی منداڵی خۆی دەنێت سوڵتان یا ئەمیر یا پاشا، وە مەسیح بە دەجالیش دەگوترێ کە لە کۆتایی ژیانی دنیا دێت و ئاژاوە

دروست دەکات و خەڵکی لە ڕێی ڕاست لا دەدات. وە ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە کە لە زمانی عەرەبی‌دا هەر ووشەیەك لەسەر کێش (وزن)ی (فعیل) بێت بە دوو مانا دێت بە مانای (فاعل و مفعول) واتە لێرەدا ووشەی مەسیح بە مانای ماسح و مەمسوح دێت. ماسح واتە دەست بەسەر دادەهێنێ. کە سیفەتی عیسا بووە دەستی بەسەر هەر نەخۆشێکدا بهێنایە بە ئیزنی خوا شیفای بۆ دەهات و چاك دەبۆوە. وە مەمسوح واتە(ممسوح العین) واتە چاو لوس چونکە دەجال چاوی ڕاستی نی‌یە و شوێنی چاویشی پێوە دیار نی‌یە.

## مانای عیسا ﷺ

لە زمانی عیبریدا عیسا واتە یشوع واتە ڕزگارکەر و ئازادی هێنەر بە مانای ئەوەی دەبێتە هۆی ڕزگاربوونی زۆر لە خەڵکی لە تاوان و گوناهەکان بە گومانی مەسیحیەکان. وە ناوی عیسا لە قورئاندا بە سێ جۆر هاتووە:

١. عیسا

٢. مەسیح

٣. ابن مریم

## مەسیح بۆچی هاتوە؟...

حەزرەتی عیسا ﷺ چەند کارێکی گرنگی گرتە ئەستۆی خۆی و دوای ئەوەی خوای گەورە ڕەوانی کرد بۆ بەنی ئیسرائیلیەکان بۆ ئەم کارانەی خوارەوە:

١. لەبەر ئەوەی بەنو ئیسرائیلییەکان ماوەیەکی زۆریان بەسەردا تێپەڕی بوو لەدینی موسا ﷺ وە لەڕێی ڕاست لایان دابوو وە گۆڕانکاریان هێنابووە سەر دینی موسا ﷺ وە زیادە ڕەویانکردبوو لە دین و لە تەورات هەروەك بەبێ ئەوەی لە تەورات فەرمانیان پێبکرێت لە ڕۆژی شەممەدا هیچ ئیشێکیان نەدەکرد. ڕاستە خوای گەورە ڕۆژی شەممەی بۆ کردبوون بە ڕۆژی پشوو و ئیسراحەت بەڵام ئەوان لەو ڕۆژەدا عیبادەت و چاکەیان نەدەکرد ئەمەشیان لە ڕێ لادان بوو. پێویستی بەڕاستکردنەوە هەبوو وە ئەگەر تەماشای ئینجیلی مەتێ بکەین دەبینین دەڵێ: لە ڕۆژی شەممەدا یەسوع و قوتابیەکانی چوونە ناو دەغڵەکان وە گوڵەکانیان لێدەکردەوە و دەیان خوارد (فریسیەکان) ووتیان عیسا چاوت لێیە قوتابیەکانت چۆن کارێك دەکەن کە لەڕۆژی شەممەدا دروست نییە. ئەویش ووتی ئایا نەتان خوێندۆتەوە کە داود و ئەوانەی لەگەڵی بون چیان کرد کە برسی بوون ... هتد. بەڵێ جولەکەکان لەبەر ئەوەی لە ڕێ خوا لاپاندەدا و زۆر پرسیاریان لە موسا دەکرد وە زۆر لە شتیان دەکۆڵیەوە و قەناعەتیان نەدەکرد بە ئایاتی تورات، خوای گەورە چەند شتێکی لێ حەرام کردن هەروەکو دەفەرموێ: ﴿ فَبِظُلْمٍ مِّنَ الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ ﴾ نساء ١٦٠ زانایان دەڵێن ئەو شتانەی خوای گەورە لێی حەرام کردن ماسی و گۆشتی ووشتر و بەزی ئاژەڵ و کارکردن لە ڕۆژی شەممە.

٢. وە لەو کارانەی کە زیادە رەویان تێدا کردبوو ماڵ پەرستی بوو کە پارە و پول هەموو مێشکی داگرتبون. وە گەورەکانیان فەقیر و هەژارەکانیان هان دەدا خێر و نەزر و چاکە بکەن بۆ هەیکەل و پاشان بە خۆیان ماڵەکەیان دەخوارد، وە ئەم فەقیر و هەژارانە و منداڵەکانیان زۆر پێویستیان بەم ماڵە بوو بۆ خۆیان جا ئەمەش لە رێ لادان بوو و پێویستی بە راستکردنەوە هەبوو. هەروەکو بەرنابا دەڵێ: یەکێك لەو کەسانەی کە لەدینی خوا بەدوور کەوتبوەوە بانگی یسوعی کرد بۆ نان خواردن کە یسوع چوو بۆ ئەوێ چەند قوتابیەکی لەگەڵ بوو، دانیشتن نان بخۆن قوتابیەکان دەستیان نەشۆشت و یەکسەر چونە سەر خوانی نان خواردن (کتبە) کان واتە نوسەرەکان بانگی یسوعیان کرد، بۆ قوتابیەکان چاودێری داب و نەریتی شێخەکانی ئێمە ناکەن بەبێ دەست شۆردن دەینە سەر سفرەی نان حواردن، یسوع وەڵامی دانەوە: منیش لێتان دەپرسم ئێوە بۆچی ئاینی خواتان بەجێهێشت لە پێناری داب و نەریت و عاداتی خۆتان و ... هتد. کەواتە عیسا ﷺ دەیویست بیان گەڕێنێتەوە سەر ئاینی راستەقینە.

٣. لە نێو جولەکەکاندا جەماعەتی (صدوقیین) هەبوون کە دەیان گوت زیندوبوونەوە نیە و حەشر و حیساب درۆیە، بەهەشت و دۆزەخ نیە، پاداشتی چاکە ئەوەیە لە دنیا چاکەت بۆ دێت، وە پاداشتی خراپەش ئەوەیە لە دونیا خراپەت بۆ دێت، ئەمەش لە رێ لادان بوو، پێویستی بە یەکێکی وەکو عیسا بوو بۆ راست کردنەوەی.

٤. لەنێو یەهودیەکان کۆمەڵێکی تر هەبوون پێیان دەگوترا (الفریسیون) ئەوانیش کۆمەڵێك بوون تەنها عیبادەتی خوایان دەکرد و دووره پەرێزیان لەخەڵك دەکرد و پشتیان بەتەواری لە دونیا کردبوو. بە هەموو توانایەك ڕوویان کردبووە قیامەت و دوارۆژ بەڵام دوای ماوەیەکی زۆر پێش هاتنی عیسا ﷺ ئەوانە لەرێ لایان داو ڕوویان کردە دونیا و لەناو خەڵك پیاری باش بوون تا پارە و پولیان لێبستێنن بەڵام هیچ عیبادەتیان نەدەکرد بەڵکو ڕووبینیان دەکرد، ئەوە کارێکی وابوو پێویستی بە پیاوێکی وەکو عیسا ﷺ بوو بۆ بن برکردنی[1].

٥. (الکتبة) واتە ئەوانەی شەریعەتی موسایان دەنوسیەوە دەرس و پەند و ئامۆژگاری خەڵکیان گرتبوە ئەستۆ. بەڵام ئەوانیش لایان داو ڕوویانکردە ووروتاندنەوەی خەڵك و پارە لێسەندنیان.

٦. (الکهنة) ئەمەش کۆمەڵێك بوون خزمەتی هەیکەلیان دەکرد و پاشان دەستیان کرد بە گۆرینی کەلامی خوا و بەکارهێنانی بۆ مەرامە گڵاوەکانیان. ئەمانە هەموویان کاری نارەوا و نابەجێ بوون و لادان بوو لە شەریعەتی خوا جا لەم کاتەدا خرای گەورە عیسای ﷺ نارد و فەرمانی پێکرد کە ئەم کارانە بگۆرێ و چاکیان بکات و بیان هێنێتەوە سەر ڕێگەی ڕاست.

---

[1] بەڵێ جولەکەکان لەبەر ئەوەی لە ڕێگای خوا لایاندەدا و زۆر پرسیاریان لە موسی دەکرد زۆر لە شتایان دەکۆلیەوە و قناعەتیان نەدەکرد بە ئایاتی تورات خوای گەورە چەند شتێکی لێ حەرام کردن هەروەکو دەفەرموێ (فبظلم من الذين هادوا حرمنا عليهم طيبات احلت لهم) زانایان دەڵێن ئەو شتانەی خوای گەورە لێی حەرام کردن ماسی و گۆشتی ووشتر و مەڕی ئاژەڵ و کارکردن لە ڕۆژی شەممە

٧.وە لەو کارە گرنگانەی کە عیسای ﷺ بۆ ڕەوان کرابوو مزگێنی دان بەوەی (ملکوت السموات) نزیك بووە واتە شەریعەتێکی نوێ لە لایەن خواوە دێتەخوارێ بۆ سەر پێغەمبەرێك کە (محمد)ە ﷺ ئەمەش لە( آیة ١٥ لە ص ١٨- سفر التثنیة) باسکراوە لە عهد القدیم کە مەسیحیەکان دەڵێن مەبەست لێرەدا عیسایە بەڵام لە ڕاستیدا مەبەستی حەزرەتی (محمد)ە ﷺ چونکە لە مزگێنیەکەدا باسی شەریعەتی نوێ دەکات بەڵام دینی عیسا شەریعەتێکی نوێ نەبوو بەڵکو ڕاستکردنەوەی عهد القدیم بوو کە گۆڕان کاری بەسەردا هاتبوو ناوی لێنرا عهد الجدید واتە پەك بەرنامەیە، بەڵام یەکێکیان عهد القدیم و دوای لادانی خەڵکی لێی و گۆڕانکاری بەسەرهات و (عهدالجدید) هات و ڕاستی کردەوە. بەڵام دینی محمد ﷺ مەبەستە و عیسا هات و مزگێنی پێدلو بێگومان عیسا کۆتایی پێغەمبەرەکانی بەنو ئیسرائیلیەکان بوو، کە ئێستا ١٩٩٩ ساڵە هیچ پێغەمبەرێکی‌تر لەوان نەهاتوە، کەواتە مەبەستی پێ محمد( ﷺ)ە. وە مەسیح مزگێنی دەدا بە وشەی : (النبی ومسیا و فارقلیط).کە تەرجومەی وشەی (بیریکلتوس)ە. واتە ئەو کەسەی سوپاسی دەکرێ بە زمانی عەرەبی (احمد) کە یەکێکە لەناوەکانی پێغەمبەر ﷺ.

## ئەو ئینجلانەی ئێستا بڵاو دەکرێنەوە

وشەی ئینجل: لە لای مەسیحیەکان واتە: ئەو ڕوداوانەی کە بەسەر عیسادا هاتون و ووتە بەنرخەکانی عیسای تێدابوو مژدەی دەدا بەوەی هەرکەسێك باوەڕ بهێنێ پاداشتی بەهەشتە، وە باسی موعجزە و ئەو کارانە

دەكات كە لەعادەتی پەیدا نابن بەلام لەسەر دەستی عیسا پەیدابوون وەكو زیندوكردنەوەی مردوان بەھێزنی خواو چاكوردنەوەی نەخۆش و دروست كردنی باڵندە لە قور و پاشان فولیكردنی و دەبووە باڵندەیەكی زیندوو بەھێزنی خوا.. هتد. هەرچەند ژمارەی ئینجیلەكان لە سەد زەت بووە بەلام كەنیسەی مەسیحی تەنها دان بەچواریان دەنێ:

١. متی،

٢. مرقس،

٣. لوقا،

٤. یوحنا.

وە ئەم ئینجیلانە لە سەردەمی عیسا نەنوسراون بەڵكو دوای عیسا هەندێك لەقوتابیەكانی یا قوتابی قوتابیەكانی هەڵسان بەنوسینی ئنجیل، وە ئەو چوارانەی كە لەھەموویان زیاتر باوەڕیان پێ دەكرێ هیچیان لەسەر زمانی عیسا وەرنەگیران بۆ زیاتر روون بونەوە:

**ئینجیلی متی:** ئەو ئینجیلەی متێ نوسیویەتی لەلای مەسیحیەكان كۆنترین ئینجیلە بەلام ئەویش متێ بەخۆی نەینوسیوە راستە متێ خۆی ئینجیلی نوسیبوو بەلام گۆرانكاری زۆریان بەسەر دا هێنا و فەوتاندیان. چونكە ئەواری مەسیحیە كۆنەكان و زۆریش لە مەسیحیەكانی ئێستا لەسەر ئەوەن كە ئینجیلی متێ بەزمانی عیبرانی نوسرابوو، بەلام ئەم نوسخەیە نەماوە، هەندێك پیری مەسیحی گۆرانكاریان بەسەردا هێنا و بەڵكو ئەوەی ئێستا هەیە تەرجومەكەیەتی، وە ناشزانن كێ

تەرجومەی کردوە. هەروەکو (جیروم) دانی بەم راستی‌یە هێناوە کە یەکێکە لە مەسیحیە هەرە کونەکان وە بەرێز (جوجس زوین- لوبنانی) دەڵێ متیّ بەشارەتەکەی خۆی واتە ئینجیلەکەی خۆی نوسی لە اورشلیم ساڵی (٣٩) هەروەکو قدیس (ابیفانوس) وای بۆ چووە. کە لە سەر داوای ئەو یەهودی‌یانە نوسیوە کە بونەتە مەسیحی، یا وەلام دانەوەی عیسا بوە واتە لەسەر داوای عیسا نوسیویەتی وە ئەم ئینجیلە بە یۆنانی نەنوسراوە بەڵکو بە عیبرانی نوسراوە لەسەر قسەی (اوسیبیوس) لە کتابەکەیدا نوسیویەتی و (اسیبیوس) و قدیس (ایرونیموس) یەک دەنگن کە (بانتیوس) چووەتە هیند لەوێ ئایەتی مەسیحی بڵاوکاتەوە و ئینجیلێکی بەزمانی عبری لە نوسینی متیّ دۆزی‌یەوە، هێنایەوە ئەسکەندەریە پاراستیان تا ماوەیەک، بەڵام لەناکاو بزر بوو، تەرجومەکەی بەزمانی یۆنانی پەیدا بوو، بەڵام نەزانرا کێ تەرجەمەی کردوە.

**ئینجیلی مرقس:** (بطرس قرماح) لەکتابەکەی دەڵێ کەناوی (مروج الاحبار في تراجم الابرار)چاپی بیروت ساڵی ١٨٨٠ ز مرقس خۆی یەهودی بووە وەلاوی بووە قوتابی بطرس بووە، لە ئیقلیمی (الخمس المدن) لەدایک بووە وە ئینجیلەکە دانا لەرۆمیەوە، وە مرقس دانی بەخوایەتی مەسیح دانەناوە لە ئینجیلی مرقسدا باسی مەسیح نی‌یە وەک ئەوانی‌تر

بەخوایەتی وە لەساڵی (٦٨) لە بەندیخانە کوژرا بە دەستی بت پەرستەکان، وە نەصرانی‌یەکان جیاوازیان هەیە لەکاتی نوسینی ئەم ئینجیلە. وە خاوەنی کتابی (مرشد الطالبین) دەڵێ مرقس لەسەر داوای بطرس ئینجیلی نوسی لە ساڵی (٦١) بۆ سود گەیاندن بەخەڵکان و ئاگاداریان بە ئاین.

**ئینجیلی لۆقا**: دیسان مەسیحی‌یەکان اختلافیان لەم ئینجیلەشدا هەیە. لۆقا خۆی دکتۆرێك بووە لەشاری (انطاکیة). وە حەزرەتی مەسیحی نەدیوە وە ئاینی مەسیحی لەسەر دەستی (پولص) وەرگرتووە. وە ئەم (پولص)ە بەڕێوەبەری بەندیخانەی پاشا بووە وە زۆر رەگەز پەرست بووە. دژی مەسیحیەکان، هەر چەندە ئەویش مەسیحی نەدیوە، زۆر خراپەی لەگەڵ مەسیحیەکان دەکرد، وە کە بیری کردەوە بەم رەگەز پەرستی‌یە هیچ زیانێك بە ئاینی مەسیحی و مەسیحیەکان ناگەیەنێ، ئەم جارە لەرێی فرۆفێڵەوە ... ووتی من کاتێك هۆشم لەخۆم نەبوو (صرع) گرتمی لە کاتێکدا مەسیح دەستی گەیاندە لەشی من و ووتی چارێکی‌تر زیان بەئوممەتی من مەگەیەنە. جا بە گومانی خۆی لەو کاتەدا مەسیح پێی گوت برۆ لای مەسیحیەکان و ئامۆژگاریان بکە، ئەم ئینجیلەشی نوسی و توانی بەفرۆفێڵ دەست بەسەر کەنیسەدا بگرێ. وە هەر ئەو بوو

مەسیحیەکانی توش کرد کە دەست لە ئەرك و واجباتی خوا بدەن کە مەسیح هێنابووی، وە بۆی حەڵاڵ کردن کە گۆشتی مردار و بەراز بخۆن و شەراب و مسکرات بخۆنەوە، وای تێگەیاندن کە تەنها باوەڕ بوون بە بێ‌کردەوە سەریان دەخات و دەیسان باتە بەهەشت. وە نوسینی لۆقا بۆ ئینجیلەکەی دوای مرقس بوو، وە دوای مردنی (بطرس و بولص) بوو، وە لە سەرەتای ئینجیلەکەیدا دەڵێ من بە نامە ناردومە لای (ثاوفیلس) بۆ ئەوەی تەئکید بکات لەسەر راستی ئەم کەلامە. کەواتە ئینجیلەکەی الهامی نەبووە هەروەك ئەوان وا تێ‌گەیشتون، هەروەك (مستركدل) وا دەڵێ وە (جیروم) دەڵێ زۆربەی زانایانی مەسیحی کۆن گومانیان هەیە لە بەندی یەکەم و دووەم وە ئەم دوو بەندە لە نوسخەی ( مارسیون) نەبووە، وە (اکهادن) لە (١٠٩٥ز) لە کتابەکەیدا دەڵێ : بەشی (٤٣-٤٧) لە بەندی (٢٢) لە ئینجیلی لۆقا پێ‌ی وە نوساوە وانە بۆی زیاد کراوە. وە (اکهادن) دەڵێ لە کتابەکەی خۆیدا ل(١٦١) زۆر درۆ و گێرانەوە لە ناو معجزاتی لۆقا گێراویەتەوە و تێکەڵاو بووە، وە لۆقا زۆر شتی زیادی نوسیوە کە مەتیٚ نەی‌نوسیوە گەیشتۆتە زیاتر لە بیست جێگا.

**ئینجیلی یۆحەننا:** زۆربەی مەسیحیەکان لەسەر ئەو رایەن یوحەننا الانجیلی قوتابی مەسیح بووە یەکێك بووە لە دوانزە قوتابیـەکانی، باوکی ناوی (زبدی) الصیاد بووە، لە صیدا لە دایك بووە وە عیسا زۆری خۆشویستوە، جوجیـس زویـن متوحـی لوبنانی دەڵێ: (شیرنطوس) و (ابیسون) و کۆمەڵەکەیان خەڵکیان وا فێر دەکرد کە مەسیح مرۆڤە و خوا نیـیە لە پێش دایکی خۆی مەریەمە نەبووە، هەروەکو هەندێکیان وا گومان دەبەن، جا بۆ ئەم مەبەستە لە ساڵی (٩٦ز) رەوشـەنبیرەکانی ئاسـیا کۆبوونـەوە لـە لای (یوحنـا) داوایـان لێکـرد کـە دەربـارەی مەسـیح بنوسـێ و بـە شـێوەیەکی وا باسـی بکـات کـە ئـەوانیتر بـەو نوسـینە باسیان نەکردبێ ئەویش داواکەی ئەوانی جێبەجێکرد و ئەو ئینجیلەی نوسی، جا هـەندێك لـە مەسـیحیەکان دەڵێن لـە ساڵی(٦٥ز) نوسراوە، هـەندێکی تر دەڵێن لـە ساڵی(٩٦ز)، وە هـەندێکیتریش دەڵێن لە سـاڵی (٩٨ز) دا نوسراوە، وە زۆربەی زاناکانی مەسیحی دڵنیان بەوە دانەناوە کە ئـەم ئینجیلە لە دانانی یوحـەننای قوتـابی عیسـا ﷺ بێ جـا لەبـەر ئـەوە (استادلن) لـە بـەرگی حەوتـەمی کتابەکـەی خۆیـدا لــە سـاڵی (١٨٨٤ز) نوسیویەتی وە (هرالد) هاورێی کاثولیك دەگێرێتەوە کە دەڵێ: ئەواوی ئینجیلی یوحـەننا لە دانـانی قوتابییەکی

قوتابخانەی اسکندریەیە. وە (برطشنیدر) دەڵێ: ئەم ئینجیلە و تەواوی نامەکانی لە دانانی یوحەننای قوتابی عیسا نییە، بەڵکو یەکێك لە قوتابییەکانی یوحەننا نوسیویەتی لە سەرەتای سەدەی دووەم وە پاڵی داوە بۆ لای یوحەننا بۆ ئەوەی خەڵك برەوی پێ بدات.

## ئینجیلی بەرنابا

بەرنابا یەکێك بووە لە شوێن کەوتوانی مەسیح ﷺ ئاینی مەسیحی بڵاودەکردەوە وە مژدەی دەدا بەوەی کە (ملکوت السموات) واتە هاتنی ئاینێکی ئاسمانی نوێ نزیك بۆتەوە کە ئاینی ئیسلامە وە لە کتاب الاعمال ص١١و١٢و١٣و١٤و١٥ باسی بەرنابا دەکا کە پیاوێکی ئاین پەروەر بووە و خەڵکی فێری ئاینی مەسیحی کردوە و باوەڕ پێکراو بووە. جا بەرنابا ئینجیلێکی نوسیوە کە بریتییە لە روداوی عیسا ﷺ بە تەواوی بەڵام ئەویش وەکو ئینجیلەکانی تر سەنەد و دەرچوونی لە نوسەرەکەی دەبڕێتەوە و نەیان گەیاندۆتە عیسا ﷺ وە قسەو گفتوگۆی زۆری لەسەر هەیە، رێگای مێژوونوسانی تێکەڵاو کردوە، زانایان زۆر هەوڵیاندا هیچ چارەسەریان پێ نەدۆزرایەوە. وە نوسخەیەکی لە پەتوکخانەی پاپا (سکتس) هەبوو لە رۆما، وە یەکێك لە رۆشنبیرەکانیان چاوی پێکەوت و خوێندیەوە و بوو بە موسوڵمان کە ناوی (فرایمر) یا (فرامرینو) بوو لە کۆتایی سەدەی شانزەهەمدا. وە بەرێز (خلیل سعادە) وەرگێری ئینجیلی بەرنابا دەڵێ (نوسەری ئەم ئینجیلە -چونکە هەروەکو گوتمان بەرنابا خۆی نەینوسیوە-

یەهودی بووە زانیاری زۆری لەسەر ئاینی یەهودی هەبووە، پاشان بوو بە مەسیحی و زانیارییەکی زۆری پەیدا کرد و پاشان بوو بە موسوڵمان، چونکە بە راستی ئەم ئینجیلە رەوان بێژی جوانی تێدایە و ووشەکانی پڕ ماناو رێك و پێکن، وە راستی تێدا نوسراوە، هاتی حەقُ دەدات بۆ چاکە و دورکەوتنەوە لە خراپە. بڵاوکەرەوەی شەرحی ئینجیلی بەرنابا بەڕێز (محمد رشید رضا) لە پێشەکی‌یەکەی دەڵێ: لە مێژووی مەسیحی‌یەکان نەماندیتوە باسی ئینجیلی بەرنابا بکرێت تەنها پاپا (جلاسیوس)ی یەکەم لە کۆتایی سەدەی پێنجەم باسی کردوە لەو پەرتوکانەی کە خوێندنەوەیان قەدەغەیە یەکێك لەم کتابانە (ئینجیلی بەرنابا)یە. چونکە راستی تێدا باس کراوە بە راشکاوی باسی ئاینی ئیسلام و حەزرەتی (محمد ﷺ) دەکات، هەرچەند لە هەندێ شوێندا زیادە رەوی تێدایە. د. خلیل سەعادە لە پێشەکی‌یەکەی دا دەڵێ: ئاشکرا بووە کە ئینجیلێکی‌تر هەبووە بە ناوی (الاغنطسی) کە لە پێشەکی‌یەکەی باسی پاپا (بولص) دەکات و رەخنەی لێ دەگرێ لە کوتایی‌یەکەی هەروەکو ئینجیلی بەرنابایە. بەڵام شوێنەواریشی نەماوە و بزرکراوە و ئێستا نابینرێ، وا پێ‌دەچێ کە نوسەری ئینجیلی (الاغنطسی) باوکی نوسەری ئینجیلی بەرنابا بێ.

## الحواریون - قوتابیانی عیسا ﵇

حوارییەکان هاورێ و قوتابی حەزرەتی عیسا بوون ﵇ یەکەم کەسانێك بوون باوەریان پێ هێنابوو، وە دەرسیان لەلای دەخوێند و

زانستی زۆریان لێ وەرگرتبوو، وە ئەم حوارییانە ژمارەیان دوانزە بوو، متیٰ لە ص١٠ دا ناویان دەبا و دەڵێ:

١. (سمعان) کە پێیان دەگوت بطرس.

٢. اندراوس برای سمعان بوو.

٣. (یعقوب) کوری زبدی.

٤. (یوحنا) برای یعقوب.

٥. (فلیبس).

٦. (برثولماوس).

٧. تۆما.

٨. (متیٰ العشار).

٩. (یعقوب) کوری حلفی.

١٠. (لباوس) کە پێیان دەگوت تداوس.

١١. (سمعانی قانونی).

١٢. یهوذای اسخریوطی.

وە بەرنابا لە بەندی چوارەم لە ئینجیلەکەی ناویان دەباو دەڵێ:

١. اندراوس.

٢. (بطرس صیاد- سمعان).

٣. بەرنابا

٤. متی عشار

٥. (یوحنا) کوری زبدی.

٦. یعقوب کوری زبدی.

٧. تداوس.

٨. يهوذا.

٩. (برثو الماوس).

١٠. فليبس.

١١. يعقوب كوڕی حلفی.

١٢. يهوذا اسخريوطی.

ئینجیلی بەرنابا ناوی (توما) و (سمعان القيور) ناباو لە حوارییەکان دلیان نانێ.

جا ئەم دوانزە پیاوە یارمەتیدەری عیسا ﷺ بوون بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینی مەسیحیەت. وە خوای گەورە باسیان دەکات وە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ الْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِي إِلَى اللَّهِ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ اللَّهِ آمَنَّا بِاللَّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ۞ رَبَّنَا آمَنَّا بِمَا أَنزَلْتَ وَاتَّبَعْنَا الرَّسُولَ فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ ﴾ آل عمران ٥٢-٥٣. واتە لە کاتێکدا عیسا هەستی کوفری کرد لە ناو بەنو ئیسرائیلیەکان ووتی کێ ئاینی خوا سەردەخا و دەستی پێوە دەگرێ و خۆی لەپێناویدا بەخت دەکات ... لێرەدا ئەم حوارییانە ووتیان ئێمە یارمەتی دەری ئاینی خواین و خۆمان لە پێناویدا بەخت دەکەین. باوەڕمان بەخوا هێنا و تۆش ئەی عیسا شاهید بە کە ئێمە موسوڵمانین. خوایە ئێمە باوەڕمان هەیە بەوەی کە ناردوتە -مەبەستیان ئینجیل بوو- وە دوای پێغەمبەرەکەت کەوتین و لەگەڵ ئەو کەسانە بمان ژمێرە کە شاهیدن.

## پێغەمبەران برای یەكترن و دینەكەشیان یەك دینە

جا لێرەدا تێبینییەك هەیە ئایا بۆ حەوارییەكان وتیان (ئێمە موسوڵمانین) لە راستیدا ئاینی هەموو پێغەمبەرێك ئیسلامە، بەڵام هەریەكە ناویان لە ناو ئەو گەلانەدا جیابووە كە بۆیان چوون، هەروەكو پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرموێ: (الأنبیاء اخوة ودینهم واحد) واتە پێغەمبەران هەموویان برای یەكترن و ئاینیان یەكە كە ئاینی ئیسلامە.

## شەیتان دەستی لە عیسا ﷺ نەداوە

پێغەمبەرمان (محمد ﷺ) دەفەرموێ (كل مولود حین یولد یمسه الشیطان الا مریم وابنها) واتە هەر منداڵێك كە لەدایك دەبێ شەیتان دەستی لێدەدات، تەنها مەریەمەی كچی عمران و كورەكەی كە عیسایە ﷺ وە بێگومان دەستی لە حەزرەتی محمدیش ﷺ نەداوە، بەڵام خۆی لەگەڵ حیساب نەكردووە، چونكە عادەتی نەبوە خۆی هەڵكێشێ و فەخر بەسەر خەڵكی بكات، ئەو نەك هەر دەستی لێنەداوە، بەڵكو شەیتانی ژێردەست كردەوو، هیچی پێنەدەكوا هەروەكو خۆی دەفەرموێ من شەیتانەكەم ژێر دەست كردوە هیچی پێناكرێ و دەستە وەستان ماوە.

## بانگەوازی عیسا ﷺ بۆ شاری ئەنتاكیە

عیسا ﷺ بانگەوازی خەڵكی دەكرد بۆ سەر ئاینەكەی كە دوای موسا ﷺ هاتبوو، دەشی وت من تەورات بە راست دەزانم وە موساش ﷺ

پێغەمبەری خوایە. بەڵکو ئاینی عیسا ﷺ لە بنەڕەت و ئەحکامەکانی هەر هەمان ئاینی موسا بوو ﷺ تەنها چەند گۆڕانکارییەکی بچووکی بەسەردا هات بە فەرمانی خوای گەورە. ئینجا لەم بانگەوازەدا عیسا ﷺ ڕۆژێکیان دوو قوتابی خۆی دەنێرێتە شاری ئەنتاکیە بۆ بانگ کردن بۆ سەر ئاینی مەسیحی و ئەوانیش باوەڕیان پێ نەهێنان و عیسا ﷺ بۆ بەهێزکردنی بانگەوازەکە قوتابییەکی تریشی ڕەوان کرد و یارمەتی دوو براکەی تری دەدا. هەروەکو خوای گەورە ئەم باسەمان بۆ دەگێڕێتەوە لە سورەتی (یس) دەفەرموێ: ﴿ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا أَصۡحَٰبَ ٱلۡقَرۡيَةِ إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ ۞ إِذۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ فَقَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ ﴾ بەڵام خەڵکی شارەکە باوەڕیان نەهێنا و بە نێردراوەکانی عیسایان ووت ئێوە درۆ ئەکەن هیچ فەرمانێك لەلایەن خوای گەورە نەهاتوتە خوارەوە. ﴿ قَالُواْ مَآ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَكۡذِبُونَ ﴾ واتە ئێوەش وەکو ئێمە مرۆڤن و خوا ئێوەی نە ناردوە و درۆ دەکەن ئەوانیش ووتیان خوای گەورە دەزانێ کە ئێمە بۆ بانگەوازی خوا هاتوین و ئێمەش تەنها ئەوەمان لەسەرە کە پێتان ڕابگەیەنین بەندایەتی خوا بکەن و باوە بهێنن بەخوا و ڕۆژی دوایی... هتد.

ئینجا خەڵکەکە ووتیان ئەی نێردراوەکانی عیسا ﷺ بە ڕاستی ئێوە زۆر شومن و ئێمە لەبەر ئێوە توشی نەگبەتی هاتین. ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهُواْ لَنَرۡجُمَنَّكُمۡ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾ واتە

ووتیان ئێمە لەبەر ئێوە تووشی نەگبەتی هاتین و ئەگەر وازنەهێنن بەردە بارانتان دەکەین و ئازاری توندتان دەدەین. ئەوانیش وەڵامیان دانەوە و ووتیان: ﴿ قَالُوا طَائِرُكُمْ مَعَكُمْ أَئِنْ ذُكِّرْتُمْ بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ مُسْرِفُونَ ﴾ واتە ئێوە نەگبەتیتان لەگەڵ خۆتان دایە بەوەی بەندایەتی بۆ یەکێك جگە لە خوا ئەکەن و خەڵکێکی تاوانبارن. ئینجا مرۆڤێك بەناو (حبيب النجار) لەو سەری شارەوە هات و لە سەرەتاوە باوەڕی هێنابوو، بەڵام لەبەر خەڵکەکە نەدەوێرا ئاشکرای بکات، ئینجا خوای گەورە بەسەرهاتی ئەم مرۆڤەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: ﴿ وَجَاءَ مِنْ أَقْصَا الْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَى قَالَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ * اتَّبِعُوا مَنْ لَا يَسْأَلُكُمْ أَجْرًا وَهُمْ مُهْتَدُونَ * وَمَا لِيَ لَا أَعْبُدُ الَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ * أَأَتَّخِذُ مِنْ دُونِهِ آلِهَةً إِنْ يُرِدْنِ الرَّحْمَنُ بِضُرٍّ لَا تُغْنِ عَنِّي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا وَلَا يُنْقِذُونِ * إِنِّي إِذًا لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ * إِنِّي آمَنْتُ بِرَبِّكُمْ فَاسْمَعُونِ * قِيلَ ادْخُلِ الْجَنَّةَ قَالَ يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ * بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ * وَمَا أَنْزَلْنَا عَلَى قَوْمِهِ مِنْ بَعْدِهِ مِنْ جُنْدٍ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا كُنَّا مُنْزِلِينَ * إِنْ كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً فَإِذَا هُمْ خَامِدُونَ * يَا حَسْرَةً عَلَى الْعِبَادِ مَا يَأْتِيهِمْ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴾ يس ١٣-٣٠.

## موعجیزەکانی حەزرەتی عیسا ﷺ

موعجیزە: واتە کردنی کارێك کە لە عادەت روی نەدابێ و مرۆڤی ژیریش دانی پێدا نەهێنێ. هەروەکو خوای گەورە بە هوی ئەم موعجیزانەوە بەخەڵك دەڵێ: (صدق عبدي فیما یبلغ عني) واتە بەندە راست دەکات لەهەر شتێك کە لەلایەن منەوە پێتان رادەگەیەنێ. واتە ئەم پێغەمبەر راست گۆیە لە گوتار و کردندا. ئینجاهەر کارێك لە عادەتدا روو نەدات لەسەر دەستی پێغەمبەرانّ رووبدات پێی دەگوترێت موعجیزە ئەگەر داوای پێغەمبەرایەتی لەگەڵ بوو، بەڵام ئەگەر داوای پێغەمبەرایەتی لەگەڵ نەبوو بەڵکو پیاوێکی چاك بوو ئەوە پێی دەگوترێت (کرامەت) بەڵام ئەگەر پیاوێکی خراپ بوو ئەوا پـێی دەگوترێـت (استدراج) واتـە لەلایـەن پـەری و شـەیتانەکان ئـەم کـارەی بـۆ ئـەنجام دەدرێ. جـا حـەزرەتی عیسا ﷺ وەك پێغەمبـەرانیتر موعجیزەی هەن، بۆ نمونە:

١. دەستی بەسەر هەر نەخۆشێکدا بهێنایە ئەگەر نەخۆشـیەکە گـولی و بەڵەکیش (جذام و برص) بوایە هەر شیفای دەدا و چاك دەبووەوە بە ئیزنی خوا.

٢. شێوەی باڵندەی لە قور دروست دەکرد لە لایەن خوای گـەورە روحـی دەهاتە بەر و هەڵ دەفری.

٣. بە مردووی بگوتبایە هەڵسە و زیندوبەوە هەڵدەستایەوە و زیندو دەبووەوە بە ئیزنی خوا.

٤. بە خەڵکی دەگوت ئێوە لە ماڵەوە ماڵان زاد و زەخیرەتان هەیە خەڵکەکەش سەریان دەسورما چون ئەمەی زانی. وە جیاوازی خەبەردانی پێغەمبەران

(علیهم السلام) بە شتی بەرز و نادیار لەگەڵ خەبەردانی جادوگەر و سیحربازەکان ئەوەیە کە پێغەمبەران (علیهم السلام) خەبەر دەدەن بەبێ ئەوەی پشت بە هیچ شتێك ببەستن تەنها خوای گەورە نەبێت بەڵام جادوگەرەکان پشت دەبەستن بە ئەستێرەگەری یا پەری یا هەندێ مرۆڤی درۆزن.

بەڵام عیسا ﷺ ئەمانەی لە خۆیەوە نەزانیوە، چونکە هیچ پێغەمبەرێك زانستی غەیبی نیە بەڵکو لەلایەن خواوە ئیزنی پێدرابوو وە فێرکرابوو بۆ چەند مەبەستێك کە گرنگترینیان ئەوەیە ئەوانەی باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی عیسا ﷺ نەبوو باوەڕی پێ بکەن و سەردانەوێنن. خوای گەورە دەفەرموێ دەربارەی عیسا ﷺ: ﴿ وَرَسُولًا إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنِّي قَدْ جِئْتُكُمْ بِآيَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ أَنِّي أَخْلُقُ لَكُمْ مِنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ فَأَنْفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِ اللَّهِ وَأُبْرِئُ الْأَكْمَهَ وَالْأَبْرَصَ وَأُحْيِي الْمَوْتَى بِإِذْنِ اللَّهِ وَأُنَبِّئُكُمْ بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ۝ وَمُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَلِأُحِلَّ لَكُمْ بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ وَجِئْتُكُمْ بِآيَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ۝ إِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ هَذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ ﴾ آل عمران ٤٩-٥١. واتە عیسامان ﷺ ڕەوان کرد بۆ لای بەنو ئیسرائیلیەکان وتی من بە بەڵگە هاتومە ناوتان و لەلایەن خواوە بەڵگەم پێیە، کەوا شێوەی باڵندە لە قوڕ دروست دەکەم وە فووی لێ دەکەم و دەبێتە باڵندەیەکی تەواو بە ئیزنی خوا. وە نەخۆشی (الأك

و کوێر و بەڵەکی) چاك دەکەمەوە و مردوو زیندوو دەکەمەوە بە ئیزنی خوا وە دەزانم و پێتان رادەگەیەنم کە چ دەخۆن و چ هەڵ دەگرن لەماڵەوەتان وە ئەمەش بەڵگە و دەلیلە بۆ ئێوە ئەگەر باوەڕتان هەیە. راستی تەورات بە گونگ دادەنێم و هەندێك لەو شتانەی لێتان قەدەغە کرابوو بۆتان حەڵاڵ دەکەم بە ئیزنی خوا ... وە ئایەتی‌تریش هەن لەسەر ئەو موعجیزە و بەڵگانەی کە حەزرەتی عیسا ﷺ هێناویەتی.

## حیکمەت چی‌بوو لەو جۆرە موعجیزانە[1]

خوای کاربەجێ بۆ هەر پێغەمبەرێك چەند موعجیزەیەکی داناوە هەروەکو لە باسی موعجیزەکاندا باسمان کرد. جا موعجیزەی هەر پێغەمبەرێك بە گوێرەی زانستی ئەو سەردەم بووە و لەو کاتدا چ جۆرە زانستێك لە باو بوایە خوای گەورە موعجیزەی پێغەمبەرەکەی بە گوێرەی ئەم زانستی سەردەمە دەنارد. بۆ نموونە: لەو کاتەدا کە خوای گەورە حەزرەتی موسای ﷺ رەوان کرد زانستی جادوگەری (سحر) زۆر لە باو بوو جا ئەگەر خوای گەورە لەو کاتەدا قورئانی بناردایە کە بریەتی لە بەلاغەت و شتی تر لەو باوەڕمەدانیم خەڵکەکە باوەڕی بهێنابوایە لەبەر ئەوە خوای گەورە چەند موعجیزەیەکی دایە دەست حەزرەتی موسی ﷺ کە شایەنی ئەو کات بوو وە نزیك بوو لەو زانستەی کە خەڵکی حەزی لێ بوو، ئەوە بوو حەزرەتی موسی ﷺ گوچانەکەی فڕێدەدا و دەبوە ئەژدیها یا دەستی لەناو باخەڵی دەناو دەری

---

[1] کتێبی (التفسیر المنیر) د. وهبة الزحیلي

دەهێنا دەبوە گڵۆپێنکی بە شەوق. وە لەو کاتەی خوای گەورە حەزرەتی محمدی ﷺ رەوان کرد زانستی رەوان بێژی و بەلاغەت و هونەری زمان لە باو بوو هەر لەبەر ئەوە خوای گەورە ئەم قورئانەی رەوان کرد کە پڕیەتی لە بەلاغەت و رەوان بێژی هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴾ بقرة ٢٣. واتە ئەی ئەو کەسانەی بەرهەڵستی محمد ﷺ دەکەن ئەگەر گومانتان هەیە لەم قورئانە دە فەرموون ئێوە تەنها یەك سورەت بڵێن وە بە هاوکاری خواکانتان کە جگە لە خوا دەیان پەرستن کە بتەکانن ئەگەر راست دەکەن. وە لە کاتی ناردنی حەزرەتی عیسا ﷺ زانستی پزیشکی زۆر لەباو بوو هەموو جۆرە نەخۆشییەکیان چارەسەر دەکرد لەبەر ئەوە خوای گەورە حەزرەتی عیسای ﷺ رەوان کرد و موعجیزەکانیشی کردە زانستی پزیشکی و بە جۆرێکی وا کە نەخۆشی وا چارەسەر بکات کە پزیشکەکانی تر پێیان چارەسەر نەکرێت کە دەردی مردن و نەخۆشی کوێر و گوێ و بەڵەك بوو ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەو پەڕی کاربەجێی خوای گەورە کە یەکێك لە ناوەکانی (حكیم)ە واتە کاربەجێ.

## موعجیزەکان لە ئینجیلدا

ئینجیلەکان هەندێکیان لەو موعجیزانە باس کردوە.

١.متی: ص٨ (٢) (واذا ابرص قد جاء وسجد له قائلاً ياسيد ان اردت تقدر ان تطهرني فمد يسوع يده ولمسه قائلاً أريد فاطهر وللوقت طهر برصه).

وە لۆقا باسی کردوە ص ٥-١٢.

٢.متێ: ص٨ (٥) (ولما دخل يسوع (كفر ناحوم) جاء اليه قائد مائة يطلب اليه (٦) ويقول ياسيد غلامي مطروح في البيت مفلوجا متعذبا جدا (٧) فقال يسوع انا اتي واشفيه (٨) فأجاب قائد المائة وقال ياسيد لست مستحقاً ان تدخل تحت سقفي لكن قل كلمة فقط فيتبرأ غلامي (٩) ثم قال يسوع لقائد المائة اذهب وكما امنت ليكن لك فبرأ غلامه في تلك الساعة).

وە ئەم باسە لۆقاش باسی کردوە بەڵام گۆڕانکارییەکی کەمی هەیە.

٣.متێ: ص٨ (٢٣) (ولما دخل السفينة تبعه تلاميذه (٢٤) واذا اضطراب عظيم قد حدث في البحر حتى غطت الامواج السفينة وكان هو نائماً (٢٥) فتقدم تلاميذه وايقظوه قائلين يا سيد نجينا فاننا نهلك (٢٦) فقال لهم ما بالكم يا خائفين يا قليلي الايمان ثم قام وانتهر الرياح والبحر فصار هدوء عظيم.

کاتێك عیسا ﷺ چووە ناوکەشتی و قوتابییەکانی لەگەڵی سواربوون و شەپۆڵەکانی دەریا کەشتییەکەی هێنا و برد و هەڵی کردە با و باران و زۆر ترسان وە لەو کاتەدا عیسا ﷺ خەوتبوو هەموویان بەیەکەوە چوونە لای عیسا ﷺ و لەخەو هەڵیان ستاند و هاواریان کرد گەورەمان رزگارمان بکە، ئەویش بە ئاگا هات و ووتی چیتانە ئەی ترسنۆکەکان ئەی باوەڕ کەمەکان ... هەڵسایە پێ و با و بارانەکە وەستا.

وە متێ ص٨ (٢٨) وص٩ (١) وص ٩(١٨-٣٦) وە زۆری تریش.

## رووداوی خوان (المائدة)

له ئینجیلی متیٰ ص (١٤) ف ١٥: کاتێك که ئێواره داهات هەندێك له قوتابیانی یسوع چونه لای ووتیان لێره هیچ خواردنێك نییه وه کاتیش درەنگه رێگای خەڵك بده بچنه ئەم گوند و دێهاتانه نان بکڕن، یسوع ووتی نایەوێ بچن نان بکڕن ئێوه بیان دەنێ، ووتیان ئێمه تەنها پێنج نان و دوو ماسیمان پێیه بەشی ئەم خەڵکه ناکات، ئەویش ووتی بیهێنن، که هێنایان بە خەڵکی ووت ئێوه دانیشن رووی کرده ئاسمان و پێنج نانەکه و دوو ماسییەکەی هەڵگرت و دوعای کرد، ئینجا قەرموی وەرن نان بخۆن هەموویان تێر نانیان خوارد و شەوەی زیاد بوو هەڵیان گرت، ژمارەی پیاوەکان پێنج هەزار کەس بوو جگه له ئافرەت و منداڵ. ئەم رووداوه له قورئانی پیرۆزدا باس کراوه، خوای گەوره دەفەرموێ: ﴿ إِذْ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَنْ يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِنَ السَّمَاءِ قَالَ اتَّقُوا اللَّهَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ۞ قَالُوا نُرِيدُ أَنْ نَأْكُلَ مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعْلَمَ أَنْ قَدْ صَدَقْتَنَا وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ الشَّاهِدِينَ ۞ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا أَنْزِلْ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِنَ السَّمَاءِ تَكُونُ لَنَا عِيدًا لِأَوَّلِنَا وَآخِرِنَا وَآيَةً مِنْكَ وَارْزُقْنَا وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ ۞ قَالَ اللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ فَمَنْ يَكْفُرْ بَعْدُ مِنْكُمْ فَإِنِّي أُعَذِّبُهُ عَذَابًا لَا أُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِنَ الْعَالَمِينَ ﴾ المائدة ١١٥، واته حەوارییەکان -قوتابییەکانی عیسا- ووتیان ئەی عیسای کوڕی مریم ئایا خوای تۆ دەتوانێ (حوانێکی نان

خواردن) بۆمان بنێرێته خوارەوه عیسا ﷺ ووتی له خوا بترسن و ئەم داوایانه مەکەن. ئەوانیش ووتیان دەمانەوێ لێی بخۆین و دڵمان زیاتر پڕبێ له باوەڕ و ئیمان وه بەڵگەش بێ لەسەر ڕاست گۆیی تۆ ئینجا عیسا ﷺ ڕووی کرده خوای گەوره ووتی خوایه گیان خوانێکی نان خواردنمان بۆ ڕەوانه بکه بۆمان بکه جەژن بۆ سەرەتا و کۆتایی ئوممەتەکەم وه ڕزقمان بدەری تۆ باشترین ڕزق دەری، خوای گەورەش فەرمووی من له بۆتان ڕەوان دەکەم بەڵام دوای ڕەوانه کردنی ئەم (خوانه) و دیتنی ئەم موعجیزەیه هەرکەسێك باوەڕ نەهێنێ به شێوەیەك ئازار و ئەشکەنجەی دەدەم که هیچ کەسێکم وا ئازار نەدابێ له دونیا و له قیامەتدا. وه زانایان دەڵێن (لا اعذبه احدا من العالمین) مانای وایه ئەوانەی دوای نان خواردنەکه باوەڕیان نەهێنا و ووتیان ئەمه سیحره هەموویان بوون به بەراز و له مرۆڤایەتی دابڕان. هەندێك له زانایان دەڵێن: دوای ئەوەی خوای گەوره فەرمووی هەرکەسێك دوای نان خواردن باوەڕ نەهێنێ بەم جۆره ئازاری دەدەم ووتیان با خوانەکه نەیەته خوارەوه و لەو داواکەیان پەشیمان بوونەوه نەوەك تووشی ئەم سزایه بین، بەڵام باسی ئینجیل و پێنج نان و دوو ماسییەکه لەگەڵ ئەم باسه که خوای گەوره نەك له ئاسمانەوه سفره و خوانێکی ڕەوان کردبێت بەڵکو لەسەر دەستی حەزرەتی عیسا ﷺ بەرەکەتی خسته ناو خواردن ئەمەش هەرهاتنه خوارەوەیه لەلایەن خواوه. وه درێژەی ئەم باسه له تەفسیری (روح المعانی ج٢ ص٤١٠ باس کراوه.

حەزرەتی عیسا ﷺ زۆر موعجیزەی تری هەبووه وەکو ڕۆیشتن لەسەر ئاو و تێشکاندنەوەی شەپۆلی دەریا و ...هتد.

## ئایا راستە عیسا ﷺ کوژراوە؟

جولەکە و گاورەکان دەڵێن ئێمە عیسامان کوشت و لەسەر خاچ (صلیب) هەڵمان واسی، پاشان پیاوێك بە ناوی یوسف چوو داوای لە مەلیك کرد کە عیسا ﷺ بنێژن بەلام سەیری ئەم رووداوە بکەن لە قورئان و بەراوردی بکەن لەگەڵ ئینجیل.

دوای ئەوە عیسا ﷺ کهنە و فریسیەکانی بێچارە کرد و توانای عیسایان نەبوو لە زانست و بەڵگە هێنانەوە و خەڵکی زۆر وازیان لە گاورەتی هێنا و بونە شوێن کەوتووی مەسیح ﷺ چونە لای والی شکابەتیان کرد و شتی وایان هەڵبەست کە عیسا ﷺ لێی دوور بوو، ووتیان ئەم پیاوە (مەسیح) دەڵێ من مەلیکی یهودیەکانم ئەوانیش جگە لە قەیسەری رۆمیە دانیان بە هیچ پاشایەکی‌تر نە دەنا. والیش جەماعەتێکی نارد و لەگەڵیاندا (یهوذای اسخربوطي) رێنیشانی بۆ کردن و عیسایان ﷺ گرت و بردیانە لای والی، بەلام لەو کاتەدا کە جەماعەتی والی هاتن خوای گەورە شێوەی عیسای ﷺ خستە سەر (یهوذا) واتە هەر کەسێ یهوذای بدیتایە هیچ گومانی نەبوو کە ئەوە عیسایە ئینجا بردیان لەسەر خاچ (صلیب) کوشتیان پاشان لەکاتی نان خواردن تەماشایان کرد هاوەڵێکیان دیار نی‌یە، سەیریان کرد (یهوذاي اسخریوطي) دیار نی‌یە کە چونە دەرەوە ئەبینن یهوذا لەسەر خاچ کوژراوە و مەسیحیش دیار نی‌یە. خوای گەورە مەسیحی بەرز کردبوەوە بۆ ئاسمانەکان....

زانای گەورە (حافظ ابن کثیر) دەڵێ: (دوای ئەوەی مەسیح زانی کە دەیگرن و ئازاری دەدەن، داوای لە قوتابیەکانی کرد کە یەکێکیان لە جیاتی

ئەو بچێ خۆی بە قوربانی عیسا ﷺ بکات و جێگای بەهەشت دەبێ و پاداشتی زۆر لە لایەن خوای گەورە وەردەگرێ بەڵام هیچیان ئامادە نەبوون تەنها یەکێکیان نەبێت. کە لەشکری والی هات خوای گەورە شێوەی مەسیحی خستە سەر ئەم قوتابییە کە ئامادە بوو لەجیاتی مەسیح لەگەڵیان بچێت. ئەویان برد و وایان زانی مەسیحە و کوشتیان لەسەر خاچ). بەڵام زۆربەی زانایان لەسەر ئەو رایەن کە ئەوەی کوژرا یەهوذای اسخریوطی بوو. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَىٰ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَجَاعِلُ الَّذِينَ اتَّبَعُوكَ فَوْقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴾ [1] آل عمران ٥٥.

---

١ ووشەی (متوفيك و رافعك الي) هەشت مانای لێ دراوەتەوە کە ئەمانەن:

١ راستڕێییان بە (تقديم و تأخير) واتە ووشەی رافعك پێشان هاتووە حی و ووشەی متوفيك لە دوا رۆژدا دێتە حێ. چونکە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَإِنْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا﴾ نساء ١٥٩ واتە هەرچی خاوەنی پەرتووکی ئاسمانی هەیە لەو کاتەی عیسا ﷺ دێتە خوارەوە هەموویان باوەڕی پێ دێنن و شوێنی دەکەون، وە رۆژی دوای عیسا ﷺ شاهێدیان بۆ دەدات

٢ مەبەست لە (متوفيك) ئەوەیە چونکە خەو مردن بەیەکتری دەگوترێت واتە بەمردوو دەگوترێ خەوتو بەخەوتووش دەوترێ مردوو

٣ واتە من تۆ دەمرێنم جا کاتەکەی دیار نییە لەوانەیە لە دوای دابەزینی کۆتایی زەمان بێت کە ئاینی ئیسلام بڵاو دەکاتەوە چل ساڵ دەمێنێتەوە

٤ واتە وەکو مردووەکانت لێ دەکەم ئینجا بەرزت دەکەمەوە

٥ واتە من رۆح و لەشت دەمرێنم بەمەبەستیش واتە چۆن ئەگەر رۆح لە لەش جودا ببێتەوە بەرزدەبێتەوە خۆش ئاوا بەرزدەکەیتەوە

٦ مەبەست کۆتایی هێنان بە کردەوەکانی سەر زەوییە

واتە خوای گەورە فەرموی ئەی عیسا ﷺ من تۆ دەمرێنم وە بەرزت دەکەمەوە بۆ لای خۆم وە دەت پارێزم لە دەست دوژمنان و شوێن کەوتوانی تۆ دەردەم بەرز و بەرزترن تا رۆژی دوایی، من حوکم لە نێوان ئێوە و دوژمنانتان دەکەم. وە دەفەرموێ: ﴿ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِن شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا اتِّبَاعَ الظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا ● بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾ النساء ١٥٧–١٥٨، واتە قسەی گاور و جولەکەکان کە دەڵێن ئێمە مەسیحمان کوشتوە کە عیسای پێغەمبەری خوایە بەڵام نەیان کوشتوە وە لەسەر خاچ دلیان نەداوو بەڵکو بە گومان یەکێکیان برد و کوشتیان کە شێوەی عیسای لەسەر بوو –یهوذاي اسخريوطي–بوو. وە ئەو کەسانەی راڕایی لەسەر عیسا ﷺ دەکەن وە هەندێکیان دەڵێن کوڕی خوایە و هەندێکیان دەڵێن سیحرە، ئەوانە لە گوماندان عیسایان ﷺ نەناسیوە و زانستیان دەربارەی عیسا ﷺ نییە بەڵکو عیسا ﷺ بەندەی خوایە و هەڵبژاردەیە بۆ ئاگادار کردنەوەی خەڵکی. وە با بە یەقین و تأکید بزانن نەیانکوشتوە و عیسا ﷺ هەر ماوە و هەر زیندووە، بەڵکو خوای

---

٧ واتە من تۆ دەمرێنم هەر کاتێك بێت و کافرەکان ناتوانن بتکوژن مەبەست دڵنیاکردنەوەیە کە ناتوانن ئازارت بدەن.

٨ ئەم ئایەتە کنایەتە لە پاکی عیسی و پاراستنی لە دوژمنان هەر وەکو خوای گەورە دەفەرموێ ومکروا ومکر الله والله خير الماكرين واتە ئەوان فێڵ دەکەن و خوایش فێڵ دەکات بەڵام فێڵی خوا فێڵەکانیان هەڵدەوەشێنێتەوە وە خوای گەورە بە فێڵی هەموو کەسێك ئاگادارە

گەورە بەرزی کردەوە بۆ لای خۆی و خوای گەورە (عزیز)ە واتە لەموڵکی خۆیدا سەربەستە و بە دەسەڵاتە. وە (حکیم)ە واتە هەر کارێك بکات سودی خۆی هەیە نهێنی زۆری لە پاڵدا هەیە.

## حەزرەتی عیسا ﷺ لە سیبەری ووتە پیرۆزەکانی پێغەمبەردا ﷺ

لە ئەبو هریرە ﷺ دەگێڕنەوە کە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە فەرمویەتی: ((والّذي نفسي بيده ليوشكن أن ينزل فيكم ابن مريم حكماً عدلاً فيكسر الصليب ويقتل الخنزير ويضع الجزية ويفيض المال حتى لا يقبله احد وحتى تكون السجدة خير له من الدنيا وما فيها)) واتە سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە کە خوای گەورەیە زۆر نزیکە عیسای کوڕی مریم ﷺ بێتە خوارەوە و بێتە ناوتان حاکمێکی عەدلە و خاچ (صلیب) دەشکێنێ و بەراز دەکوژێ و جزیە و خەراج لەسەر خاوەن ئاینەکان دادەنێ و ماڵ بە سەر خەڵکی دابەش دەکات هەتا خەڵکی ئەوەندە دەوڵەمەند دەبێ کەس پارە وەر ناگرێ و تا وای لێدێت خەڵکی ئەوەندە خۆشیان دەوێت ئەگەر کرنۆش (سجدة) بۆ بەرن پێیان باشترە لە دنیا و هەرچی گەنج و خەزێنەی لە زەوی‌دا هەیە. هەروەها دەفەرموێ: عیسای کوڕی مریم دێتە خوارەوە وخاچ دەشکێنێ و پێش نوێژی بۆ خەڵکی دەکات و ماڵ دەبەخشێ و کەس وەریناگرێ لەبەر دەوڵەمەندی باج لەسەر خاوەن ئاینەکانی‌تر دادەنێ و لە (روحاء) کە جێگایەکە دادەبەزێ و حەجی ماڵی خوا دەکات ...

وە دەفەرموێ: پێغەمبەران برای یەکترن بەڵام دایکیان جیان، وە ئاینیان یەکە کە ئاینی ئیسلامە وە من لە هەموو کەسێك نزیکترم لە عیسای کوڕی مەریەم چونکە ئەو پێغەمبەرە و منیش پێغەمبەرم وە هیچ پێغەمبەرێك لە نێوانماندا نی یە، وە دادەبەزێتە سەر زەوی نیشانەکانی ئەگەر دیتان بیناسن پیاوێکی نە کورت و نە درێژە بەرز و سوور و سپی یە، دوو بەرگی لەبەردایە رەنگیان بەلای زەرد دایە سەری ئەم ئەم ئاوی لێدێتە خوارێ کەچی تەریش نەبووە، زۆر پاك و خاوێنە هەروەکو بلێی ئێستا لە حەمام هاتۆتە دەرەوە ئەوجا خاچ دەشکێنێ و بەراز دەکوژێ و باج لەسەر خاوەن ئاینەکانی تر دادەنێ و خەڵك بانگ دەکات بۆ سەر ئاینی ئیسلام، وە خوای گەورە لە سەردەمی ئەودا گشت ئاینەکانی تر لەناو دەبات تەنها ئاینی ئیسلام کە عیسا ﷺ بڵاوی دەکاتەوە و لەسەر دەستی ئەو (مسیح الدجال) دەکوژرێ و ئازاوە لەسەرانسەری زەوی نامێنێ و خۆشی و ئاسایش دەگێڕێتەوە، تا وای لێ دێت شێر و وشتر بە یەکەوە دەلەوەڕێن و پڵنگ و مانگا بەیەکەوە دەلەوەڕێن و گورگ و مەر بەیەکەوە دەلەوەڕێن وە منداڵان یاری لەگەڵ مار دەکەن و لێیان ناترسن و زەرەریان پێ ناگەیەنێ.[1] هەمووشی لەبەر بەرەکەتی ئەم زاتە پیرۆزەیە، ئینجا چل ساڵ لەسەر زەوی دەمێنێتەوە پاشان وەفات دەکات و دەمرێت موسوڵمانانیش نوێژی لەسەر دەکەن. وە پرسیار لە زانای بەرێز (محمد رشيد رضا) کرا دەربارەی دەجال و هاتنی عیسا ﷺ و کوشتنی دەجال.

---

[1] چونکە هەریەك لەم دڕندانە دوژمنی ئەم ئاژەڵەیە کە لەگەڵی ئەسترەوتەوە

فەرمووی: دەجال: واتە فیتنە و ئاشوبەو ناخۆشی، وە کوشتنی بەدەستی عیسا ﷺ واتە عیسا دەبێتە پیاوچاکێکی کۆمەڵایەتی (مصلح اجتماعی) ئەم شەر و شۆڕ و ناخۆشییە نایەڵێ و چاکی دەکات. بەڵام زۆربەی زانایان لەسەر ئەو رایەن کە دەجال پیاوێکی کوێرە و لە کوتایی زەماندا دێت و فیتنە و ئاشوب دروست دەکات و خوێن دەرێژێ و خوای گەورەش حەزرەتی عیسا ﷺ دەنێرێت و شەر لەگەڵ دەجال دەکات و لە ناوی دەبات. وە کە لە ووتەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە دەفەرموێ: ئاو لەسەری عیسا ﷺ دەبارێت: زانایان دەڵێن ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە عیسا ﷺ مردوی بە دەست زیندو بۆتەوە، چونکە ئاو نیشانەی ژیانە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ ﴾ الانبیاء ٣٠.

## کۆتایی باسی مەسیح لەلای جولەکەکان

لە لای گاورەکان (جولەکەکان) و لە پەرتوك و پەراوە مێژوییەکان بە هیچ شێوەیەك باسی مەسیحی تێدا نییە، بەڵکو لەلای ئەوان (یوسف) هەبووە، کە سەرکردەیەکی جولەکە بووە کە پێی دەوترا (یوسیفوس) لەلای ئەورووپییەکان لە ساڵی ٧١ی زاینی بووە، کە لەشکرەکەی بەرامبەر جولەکەکانی (طیطوس) شکستی هێنا و خۆی تەسلیم کرد. ئەوجا جولەکەکان مەبەستیان ئەم پیاوەیە، بەڵام هیچ راستییەکی پێوە دیار نییە. بەڕێز (عبد الوهاب النجار) دەڵێ هاورێیەکم بەناوی (ایسرائیل ولفنسون) پێی ووتم باسی مەسیح لە تەورات و پەرتوکەکانی یەهود هەبووە و بە

درێژی باس کراوە لە تلمود، بەڵام جولەکەکان دەریان هێناوە و شوێن بزریان کردوە بۆ ئەوەی هیچ کەسێك نەیخوێنێتەوە چونکە نوسینەکەی بە شێوەیەك بووە کە یهودیەکان مەسیحیان کرشتوە، ئینجا ئەم کارەیان بۆ ئەوە بوە کە خەڵکانێك دوژمنایەتی دەر نەبڕن بەرامبەر یەهود، بەڵام ئەمە نکوڵی لێ ناکرێ کە یەهودیەکان زۆر دوژمنایەتی مەسیحیان کردوە وە دوژمنایەتی شوێن کەوتوانیان کردوە وە ئەم خاچ ( صلیب)ە نیشانەی ئەوان بوە و خەڵکیان بە بزمار لەسەر ئەم خاچە قایم دەکرد و دەیان کرشت.

## کۆتایی باسی عیسا ﷺ لەلای مەسیحیەکان

لە ڕاستیدا نەسارا‌کان کۆتایی و خاتمەی مەسیحیان بەشێوەیەك باس کردوە و نوسیویانە کە لەو زاتە پیرۆزە ناوەشێنێتەوە و حەزرەتی مسیح ﷺ زۆر لەو شتانە بەرزترە و خوای گەورەش لە قورئانی پیرۆزدا ئەم شتانەی رەت کردۆتەوە، چونکە لەلای مەسیحیەکان باوەڕ بوون بە خاچ (صلیب) شتێکی بنچینەییە و هیچ کار و کردەوەیەك قبول نییە بەبێ ئەم بیر و باوەڕە، ئەم بیرو باوەڕەیان لە عهد القدیم (تورات) وەرگرتووە دوای گۆرانکاری بەسەرداهاتنی، وە دەڵێن ئادەم باوکی مرۆڤ و لە فەرمانی خوا دەرچوو بەوەی چوو لەو دارەی خوارد کە خوای گەورە لێی قەدەغە کردبوو، ئینجا بەم کارەی تاوانێکی ئەنجامدا ئەو و هەموو نەوەکانی بون بە تاوانبار، بەم کارەی شایانی ئازار و بە هیلاك دان بوون. جا نەتەوەکەی گوناهی خۆیان و باوکیان (ئادەم) هەڵدەگرن، چونکە (ئادەم) ئەصل و بنەچەی ئەم

مرۆڤـه‌یه‌، ئینجا خوای گه‌وره‌ چونكه‌ زۆر به‌زه‌یی‌یه‌ و دادوه‌ر و یه‌كسانه‌ له‌ عه‌داله‌تی ئه‌و ئه‌گه‌ر تاوان كرا ده‌بێ سزای له‌دوا بێ وه‌ سزاش دژی ره‌حم و به‌زیی‌یه‌ كه‌واته‌ ئه‌گه‌ر سزایان بدات نابێته‌ خوایكی به‌ به‌زه‌یی و دادوه‌ر.

**ئاگاداركردنه‌وه‌** (تنبه): له‌ شه‌ریعه‌تی ئیسلامدا ئه‌م بیر و باوه‌ڕه‌ دانی پێ دانانرێ چونكه‌ هیچ كه‌سێك به‌ تاوانی خـه‌ڵكیتر سزا نادرێت وه‌ تاوانی خـه‌ڵكیتر هـه‌ڵناگرێ، هـه‌ر كه‌س به‌ كار و كرده‌وه‌ی خۆی پاداشتی ده‌درێته‌وه‌ یان سزا ده‌درێ. خوای گه‌وره‌ ده‌فه‌رموێ: ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ اسراء ۱۵. واتـه‌ هیـچ نه‌فسێك تاوانی یه‌كێكیتر هه‌ڵناگرێ و پێ‌ی نابێتـه‌ تاوانبار.

ده‌ڵێن ده‌بێت ئه‌م یه‌كسانی‌یه‌ی خوا بێته‌ جێ له‌گه‌ڵ به‌زه‌یدا بۆ ده‌رچوون له‌م ئیشكاله‌، جا خوای گه‌وره‌ ویستی (كوڕی) خۆی كه‌ له‌ زاتی خۆیه‌تی بیخاته‌ ناو منداڵدانی ئافره‌تێك له‌ نه‌ته‌وه‌ی ئاده‌م و بیكاتـه‌ كۆرپـه‌ و لـه‌م ئافره‌ته‌ پـه‌یدا ببێت، ئینجا ئه‌م كوڕه‌ی ده‌بێتـه‌ مرۆڤ چونكه‌ له‌م ئافره‌ته‌ په‌یدا بووه‌ و خوایه‌كی ته‌واوه‌ چونكه‌ كوڕی خوایه‌ وه‌ (معصوم) پارێزراوه‌ له‌ هـه‌موو تاوان و گوناهێك، پاشان كه‌ ژیا وه‌كو ژیـانی خـه‌ڵك و خـواردن و خواردنه‌وه‌ی به‌كارهێنا وه‌كو خه‌ڵكیتر خۆشیی و ناخۆشی هه‌ست پێكرد، دوژمنانی خوا دێن به‌ شێوه‌یه‌ك ده‌یكوژن كه‌ زۆر ناشرین بێت و له‌ داب و نه‌ریت به‌ده‌ربێت، ئه‌ریشیان ئه‌وه‌یه‌ كه‌ له‌سه‌ر خاچ (صلیب) قایمی بكه‌ن به‌

بزمار پاشان بیکوژن دوای شەق و زللە لێدان و گاڵتە پێکردن درك و ئەستری لەسەر سەری دەبەستنەوە ئەمەش بۆ ئەوەیە کە خۆی بەخت بکات لە پێناو مرۆڤایەتی‌دا کە تاوانیان کردووە.

منیش دەڵێم: بە راستی ئەمە هیچ یەکسانی و عەدالەتی تێدانی‌یە، چونکە لە عەدالەتی خوای گەورە نەبووە کەسانێك ئازار بدرێت و بکوژرێت بە تاوانی خەڵکی‌تر کە خۆی نەی کردووە لێی دوورە، ئینجا بەتایبەتی ئەم زاتە پاك و بێ‌تاوانە.

ئەگەر عیسا ﷺ هەروەکو لەم باسەی رابردودا دەڵێ خوا ویستی کوڕی خۆی لە نێو منداڵدانی ئافرەتێکی نەتەوەی ئادەم دابنێت راست بێت دەبێ عیسا ﷺ خوا بێت -اعاذنا الله- خوا بمان پارێزێت، بە راستی تاوانێکی گەورەیە چونکە هەر وەکو لە پێشەوە باسمان کرد خوای گەورە نە باوك و نە دایك و نە ژن و نە کوڕ و نە کچی نی‌یە هەرەکو دەفەرموێت: ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ۞ اللَّهُ الصَّمَدُ ۞ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۞ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ ﴾. جا ئەگەر عیسا ﷺ خوا بێت ئەوا دژایەتی دروست دەبێت چونکە کوا عیسا ﷺ دەستی هەبووە لە دروست کردنی زەوی و ئاسمان و بەنی ئادەم و ئاو و هەوا و رۆژ و مانگ ... هتد، جا ئەگەر دەستی لە دروسکردنی ئەم شتانە نەبووبێت چۆن دەبێتە خوا؟ چونکە خوا دەبێت دەسەڵاتی هەبێت و هەموو کارەکانی بە دەستی خۆی بێت هەر کارێك بیەوێت بیکات هەر چەند گران و گەورە بێت دەتوانێت بیکات، هەر وەکو لە ئینجیلی لۆقا هاتووە (لانە لیس شیء غیر ممکن لدی الله) واتە: هیچ شتێك نی‌یە لەژێر دەسەڵاتی خوا

دەربچێ. وە بەرنابا دەڵێ: ئەو خوایەی توانی مرۆڤ دروست بکات بەبێ مرۆڤی‌تر. دەشتوانێت مرۆڤێک دروست بکات بە بێ باوک. ئایا عیسا ﷺ تەنها لەم باسەدا هیچ دەسەلاتێکی هەبووە کە لە دایک بوونی خۆیەتی؟ بێگومان نەخێر جا ئەگەر خوا بێت نابێت هیچ کەسێک دەسەلاتی بەسەردا بڕوات و بتوانێ ئازاری بدات و بیکوژێ، و خوا مردنی نی‌یە. وە ئەم باسە لەگەڵ ئینجیلیش دژایەتی هەیە چونکە عیسا ﷺ زۆر پیرۆز و پیاوچاک بووە. وە بە گوێرەی ئینجیل ئەو کەسانەی لە خاچ قایم دەکران و دەکوژران پیاوی خراپ بوون و ملعون بوون.

(تثنية) ص٢١ (٢٢) ئەگەر مرۆڤێک تاوانی کرد حەقی خۆیەتی بکوژرێت و لەسەر دار هەڵبواسرێ. وە تەرمەکەشی تەنها یەک شەو لەسەر دار نامێنێتەوە بەڵکو هەر ئەو رۆژە دەنێژرێ. چونکە ئەو پیاوەی هەڵدەواسرێ (ملعون)ە واتە دورە لە رەحمەتی خوا وە زەوی پیس مەکەن بەم پیاوە.

وە هەر (کتاب المقدس) دەڵێ کوڕ و کچ و نەتەوە لە جیاتی باوکیان ئازار نادرێن وە بە پێچەوانەش:

(تثنية) ص٢٤ (١٩): باوک لە جیاتی کوڕ ناکوژرێت و کوڕیش لە جیاتی باوک ناکوژرێت بەڵکو هەرکەس بەتاوانی خۆی.

## بیرو باوەڕی لەخاچ دان و خۆ بە قوربان کردن بیرو باوەڕێکی بت پەرستانەیە

لە کتابی(العقائد الوثنية في الديانة النصرانية)ی (محمد طاهر البوروني افندي)دا زۆری لەو شتانە باس کردووە کە مەسیحی و بت پەرستەکان وەکو

یەکن و تێیدا بەشدارن وە ئەگەر هەمووی بنوسم باسەکەم زۆر درێژ دەبێت بەلام چەند نمونەیەکی باس دەکەم انشاء الله.

١. خۆ بەخت کردنی خوایەك لە پێناو گوناهی خەڵکیتردا بیر و باوەڕێکی زۆر کۆنە لە هیندیەیە بت پەرستەکانەوە هاتووە بەڵگەش نوسەر (دوان) خاوەنی (خرافات التوراة وما يقابلها من الديانات الاخرى): هیندیەیەکان بیر و باوەڕیان وایە کە (کرشنا) کوڕی یەکەمی (فشنو)ی خوایەکەیانە. کە (فشنوا) سەرەتا و کۆتایی نیە لەبیر و باوەڕی ئەواندا، هەوڵیدا بۆ رزگارکردنی مرۆڤایەتی و خۆیبەخت کرد. نوسەر (مستەرموزی) دەڵێ: وێنەی (کرشنا)ی کێشاوە کە بە بزمار قایم کراوە لەسەر خاچ (صليب). وە وێنەی تری هەیە کە بە بزمار قایم کراوە لەسەر خاچ و وێنەی دڵی لەسەر کراسەکەی دروست کراوە و کلاوێکی زێرینی لەسەرە. کەواتە هیچ جیاوازیەك نەبوو لە نێوان هیندیەیە بت پەرستەکان و مەسیحیەیە خاوەن پەرتوکە ئاسمانیەکان.

٢. (هۆزینۆ لیموزس)[١] دەڵێ: هیندیەیەکان باوەڕیان بە تاوانی سەرەکی هەیە و لە مناجات و پاڕانەوەدا لە دوایی (کیاتری)دا دەیانگوت من گوناهبارم وە تاوانم کردووە و دەرونم پیس و بزگەنە وە دایکم منی توشی ئەم تاوانە کرد. ئەجاتم بدە ئەی خاوەن دیتن و ووردبین ئەی رزگارکەری گوناهباران لە تاوان و گوناه.

---

١ كتيبى (العود) ل٣٦.

٣. قەشە (جۆرج كزكس)[1] دەڵێ: دەربارەی هیندییە بت پەرستەكان و باسی (كرشنا) دەكەن كە پاڵەوانی خزبەخت كەرە، دڵی پڕ لەخوا پەرستی بووە، چونكە خۆی پێشكەش كرد كە ببێت بە قوربانی مرۆڤایەتی.

جا بیر و باوەڕی مەسیحییەكانیش هەر وایە كە دەڵێن مەسیح خۆی بەخت كرد و خۆی كرد بە قوربانی نەتەوەكەی، وە هەر تاوانێك مەسیحیەكان بیكەن خوا لێی خۆش بووە، چونكە مەسیح خۆی بەخت كردوە.

بە ڕاستی ئەمە بیر و باوەڕێكی پووچ و گەندەڵە هەروەكو لە پێشەوە ووتمان هیچ كەسێك تاوانی كەسانیتر هەڵناگرێ و بە تاوانی ئەو ناسووتێ، بە تایبەتی مرۆڤێكی وەكو عیسا ﷺ پاك و بێتاوان چۆن دەبێت بكرێتە قوربانی خەڵكانێك كە لە فەرمانی خوا لابدەن. وە (هیجین) دەربارەی (اندرادا الكوریپروس) دەڵێ: یەكەم كەس بووە هاتۆتە وولاتی (تبت و نیبال) وە خەڵكی پەرستویانە، وە خۆی بەخت كرد بۆ مرۆڤایەتی و كرشتیان و لە سەر خاچ قایمیان كرد بە بزمار، وە لە كتابی (جۆرجیس الراهب)دا وێنەی (اندرادا) دروست كراوە كە لەسەر خاچ باستراوەتەوە.

٤. وە ئەوەی دەربارەی (بوذی)ەكان هاتووە تەواو لەگەڵ بیر و باوەڕی مەسیحییەكان یەك دەگرێتەوە لە هەموو ڕووەكانییەوە، وە ئەوانیش ناو لەخوایەكەیان دەنێن (مسیح)، (یەكەم لە دایك بووی ڕزگاركەری جیهان)،

---

١ كتێبی (الديانات المقدسة).

وە دەڵێن مرۆڤێکی تەواو بووە و خوایەکی تەواویش بووە و چۆتە ناو لاشەی (ناسوت) وە خۆی پێشکەش کردووە کە ببێتە قوربانی بۆ مرۆڤایەتی و سڕینەوەی تاوانی مرۆڤ واتە: هەر مرۆڤێك تاوانێك بکات سزا نادرێت لەبەر و باوەڕەی ئەواندا چونکە خوایەکەیان خۆی بەخت کردووە.

وە زانا ئەوروپییەکان زۆر لەم باسە دواون وەکو (هۆك) و (بیلی) و (مۆلەر) و ...هتد. جا ئەگەر بەراوردێك بکەین لە نێوان باوەڕی مەسیحییەکان بۆ مەسیح و باوەڕی هیندییەکان بۆ (کرشنا) و باوەڕی خەڵکی تبت و نیبال بۆ (ئەندرادا) و باوەڕی (بوذی)یەکان بۆ مەسیحەکەی خۆیان هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان بیرو باوەڕەکانیاندا. بەڵام ئاینی پیرۆزی ئیسلام نەك هەر عیسا ﷺ بەڵکو (محمد)یش ﷺ بە بەندەی خوا دادەنێت و هیچ جیاوازیەکی نییە لەگەڵ خەڵکانیتر تەنها پێغەمبەرایەتی نەبێت. هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ ﴾ آل عمران ١٤٤.

## ئینجیلەکان و هەڵواسینی مەسیح ﷺ

ئینجیلەکان هەریەکە بەشێوەیەك باسی کوشتن و هەڵواسینی مەسیح دەکەن جا ئەگەر باسەکە زۆر درێژ نەوایە تەواوی ئەم باسانە لە هەر چوار ئینجیلەکانم دەنوسی، بەڵام تەنها ژمارەی ئیصحاحەکان و ئایەتەکان دەنوسم.

ئینجیلی لۆقا ص ٢٦ (٣٦)

ئینجیلی مرقس ص ١٤ (٣٢)

ئینجیلی یوحنا ص ١٨ (١)

وە ئەم جیاوازییە لە کتابی (قصص الانبیاء ی (عبدالوهاب النجار) باس کراوە ل ٤٣٧.

## دوای هەڵواسین

لەم باسەشدا ئینجیلەکان گۆڕانکاریان هەیە بڕوانە کتابی (الفارق بین المخلوق والخالق) ل ٢٤٨.

وە لە ئینجیلەکان:

متى ص ٢٦ (٥٧-٧٥)

یوحنا ص ٢٠ (١٩)

لۆقا ص ٢٣ (١٠)

لۆقا ص ٢٣ (٢)

یوحنا ص ١٨ (٢٨) و ما بعدها

## ڕاڕایی مەسیحییەکان لە باسی خاچ

مەسیحییەکان یەک دەنگ نین لە سەر باسی لە خاچ دانی مەسیح ﷺ بەڵکو زۆربەیان دەڵێن ئەم باسە هەر ڕاست نییە وەکو:

١. ساتریتوسییەکان.

٢. کاریوکرانی‌یەکان.

٣. مرکیوسی‌یەکان.

٤. باردیسبانی‌یەکان.

٥. تاتیانیسی‌یەکان.

٦. بارسکالیونی‌یەکان.

٧. پۆلصی‌یەکان.

وە هەندێکیان دەڵێن ئەوەی لە خاچ درا پیاوێکی‌تر بوو جگە لە مەسیح. دوژمنەکانی زەفەریان پێنەبرد بوو وە مەسیح بەرزکرابەوە بۆ ئاسمانەکان ئەوانیش:

١. دۆسیتی‌یەکان.

٢. مرسیونی‌یەکان.

٣. فلنطنیائی‌یەکان.

وە زۆر لە زانا مەسیحی‌یەکان شاهێدیان داوە کە لە ئاینی ئیسلامدا باشتر و راست تر باسی حەزرەتی مەسیح ﷺ کراوە بۆ نموونە:

١. مسیو (الرادولرنسیوس)ی بەناوبانگ کە ئەندامی (ئەنسیتودی فرانسی) لە پاریس بووە. وە بەناوبانگ بووە بە دژایەتی کردنی موسوڵمانان لە کتابەکەی بە ناوی (عقیدة المسلمین فی بعض المسائل النصرانیة)دا لە ل(٤٩)دا دەڵێ (قورئان دان بە کوشتنی مەسیح دانانێت وە دان بە هەڵواسینیشی دانانێت بەڵکو دەڵێت وێنەی مەسیح خرابە سەر یەکێک لە قوتابیەکانی وە بەهودی‌یەکان بەهەڵەچوون لە گومانەکەیان کە دەڵێن مەسیح کوژراوە). وە ئەوەی لە قورئاندا هەیە لە لای هەندێک لە

گروپەکانی مەسیحیدا هەیە وەکو (باسیلیدییەکان کە باوەڕیان وایە دەڵێن باوەڕێکی زۆر خوایە کە دەڵێن عیسا ﷺ کوژراوە و لە خاچ دراوە بەڵکو شێوەی عیسا ﷺ خوایە سەر (سیمون) و وێنە سیمۆنیش خوایە سەر مەسیح. تا سیمۆنیان برد و کوشتیان و مەسیحیش خۆی بەرز کرد لە دەست یەهودییە بە هەڵەچووەکان. وە هەروەها (سرنتیەکان) دەڵێن یەکێک لە حوارییەکان لە خاچ درا لە جیاتی مەسیح.

٢. (الهرارنست دی بونس)ی ئەڵمانی لە کتابەکەیدا بەناوە (الاسلام أي النصرانیة الحقة) ل١٤٢ دا دەڵێ هەر باسێکی پەیوەندی بە خاچ و خۆبەختکردن و کوشتنی مەسیح هەیە هەمووی دروست کراو و هەڵبەستراوی (پولس) و هاو وێنەکانی‌یەتی لەواتەی کە مەسیحیان نەدیوە، ئەم هەڵبەستانەش لەناوەڕۆکی ئاینی مەسیحیدا نییە.

٣. (ملمن) لە کتابەکەیدا بەناوی (تأریخ الدیانة النصرانیة)دا دەڵێ تەنفیزکردن و جێبەجێکردنی فەرمان بەسەر مەسیح دا بۆ لە خاچ دانی لە کاتی شەو و تاریکی بوو وە لەم کاتەدا توانرا مەسیح بگۆڕنەوە بە یەندیکیتری بەندیخانەی (قودس) کە ئەویش چاوەڕێی لە خاچ دان بوو.[1]

## دوای لە خاچ دان

لەبەر ئەوەی ئێمەی موسوڵمان باوەڕمان بە لە خاچدان و کوشتنی حەزرەتی عیسا ﷺ نییە باسیشی لێناکەین بەڵام مەسیحییەکان لەگەڵ

[1] کتێبی (الفارق بین المخلوق والخالق)ی ناحەمی ل ٢٨١-٢٨٢

ئەوەی باوەڕیان پێ‌هەیە و ڕاڕایی زۆریش هەیە لە نێوان تایفە مەسیحی‌یەکان، جا هەندێکیان دەڵێن دوای ئەوەی خەڵکەکە هەموویان ووتیان با مەسیح لە خاچ بدرێت و (پیلاطس) دەست و پێی خۆی لە پێش چاوی خەڵکەکە شۆشت و ووتی من بەریم لە خوێنی ئەم گەنجە، ئینجا مەسیحیان برد و جلەکانیان داکەند و بردیان بۆ لە خاچ دان، وە مەسیحی‌یەکان ڕاڕایی زۆریان هەیە لە باسی مەسیح ﷺ دوای ئەوەی لە خاچ درا، وە دەڵێن هیچ کەسێک نەیتوانی بچێت لەسەر خاچ بیهێنێتە خوارەوە، تەنها پیاوێك بەناوی (یوسف) چووە لای (پیلاطس) و ووتی من گۆڕێکم بۆ خۆم هەڵکەندووە ئەگەر ئێوە ڕازی بن من مەسیح لەناو ئەو گۆڕەدا دەنێژم، (پیلاطس) ڕازی بوو مەسیح لەناو گۆڕەکەدا نێژرا، ئەمە لە باوەڕی مەسیحی‌یەکاندایە ئەگینا مەسیح هەر ئاگاشی لەم باسە نەبووە، بەڵکو هەر لەگەڵ هاتنی پیاوەکانی پاشا خوای گەورە شێوەی حەزرەتی عیسای ﷺ خستە سەر قوتابی خائن (یهوذای اسخریوطی) کە دەلیل وێ پیشاندەری پیاوەکانی پاشا بوو بۆ لای عیسا ﷺ، ئینجا پیاوەکانی پاشا وایان زانی کە (یهوذا) مەسیحە و بردیان لە خاچ بەستیانەوە و هەر لەم کاتەدا خوای گەورە حەزرەتی عیسای بەرز کردەوە بۆ ئاسمانەکان.

## هەڵسانەوەی لە ناو گۆڕ

ئەم باسە زۆر جیاوازە لە نێوان ئینجیلەکان بەڵام ئێمە ئینجیلی متی باس دەکەین ئینجا جیاوازی‌یەکانی متیٰ و مرقس و لوقا و یوحنا.

مەتی ص٢٨ (١) لە دوای رۆژی شەممە لە بەرەبەیان مەریەمەی مەجدەلیە و مەریەمەیەکیتر هاتن سەیری گۆڕەکە بکەن (٢) بەلام لە پڕێکەوە زەمین لەرزەیەك هات و ئەمەش لەبەر ئەوە بوو فریشتەی خوا هاتە سەر زەوی بەردەکەی دەمی گۆڕەکەی لابرد و لەسەری دانیشت (٣) وە شێوەی فریشتەکە وەکو بروسك وابوو جل و بەرگەکەی وەك بەفر سپی بوو (٤) ئینجا حەرەسەکان لە ترسان وەکو مردویان لێ هات (٥) وە فریشتەکە هات و بە هەردوو مەریەمەکەی ووت مەترسن من دەزانم ئێوە بە دوای یسوع دا دەگەڕێن ئەو یسوعەی کە لە سەر خاچ هەلواسرابوو (٦) بەلام لێرە نی‌یە چونکە ئەو هەلساوەتەوە هەر وەکو خۆی ووتی بڕۆن سەیری ئەو جێگایە بکەن کە لە سەری پال کەوتبوو (٧) پاشان زوو بڕۆنەوە وە بە قوتابیەکان بڵێن یسوع لە ناو مردووەکان هەلساو لە پێش ئێوەدا دەچێتە شاری جلیل ئێوە لەوێ دەیبینن وا من بە ئێوەم ووت (٨) ئینجا هەردوو مەریەمەکە هاتنە دەرەوە بە پەلە و بە ترس و بە دڵ خۆشی بە غارێکەوە چوون بە قوتابیەکانیان راگەیاند (٩) لە کاتێکدا دەیانویست بچن ئەم خەبەرە رابگەیەنن لە ناو قوتابیەکان لە رێگادا گەیشتنە مەسیح پێی ووتن سەلامتان لێبێت ئەوانیش لێی چونە پێش و کڕنوشیان بۆ برد و پێیەکانیان ماچ کرد (١٠) یسوع پێی ووتن مەترسن و بڕۆن بە قوتابیەکان بڵێن بچنە شاری جلیل لەوێ بمبینن (١١) لە کاتێکدا ئەوان دەیان ویست بچن بۆ لای قوتابیان بەلام خەلکانێك لە حەرەسەکان چوون بۆ شار و تەواوی باسەکەیان راگەیاند بە کهنە و خەلکیتر (١٢) ئەوانیش کۆبوونەوە و پرس و رایان گۆڕییەوە بەخشیشێکی زۆری زیویان دایە سەربازەکان (١٣)

وە پێیان ووتن ئێوە بڵێن قوتابیەکانی هاتن و لاشەی مەسیحیان دزی و ئێمەش خەوتبوین (١٤) ئەگەر والی پێی زانی ئێمە رازی دەکەین ئێوەش دڵتان ئارام بێت و مەترسن (١٥) ئەوانیش زیوەکەیان هەڵگرت و فەرمانی کاهنەکانیان جێبەجێکرد ئێنجا ئەو باسە وا بڵاوبووەوە کە لاشەی مەسیح دزراوە (١٦) بەڵام یانزە قوتابیەکە -دوانزە بوون بەڵام یهوذای اسخریوطی خائن بوو مەسیحی دایە دەست یەهودیەکان چوون بۆ شاری جلیل کە یسوع فەرمانی پێکردبوون (١٧) کە بینیان کڕنوشیان بۆ برد بەڵام هەندێکیان گومانیان هەبوو کە مەسیحە یان نا لەبەر ئەوە کڕنوشیان بۆ نەبرد (١٨) مەسیحیش لێیان هاتە پێش و ووتی بچنە پێش بۆ هەموو توانایەك لە ئاسمان و لە سەر زەوی (١٩) بڕۆن خەڵکی فێر بکەن رایان بهێنن لەسەر ناوی (اب وابن وروح القدس) واتە: باوك کە خوای گەورەیە - کوڕ کە عیسایە - وە روح القدس کە جبرێلە وە فێریان بکەن هەموو ئەو وەسیەتانەی من بە ئێوەم ووتبوو وە من لە گەڵتانم گشت رۆژێك تا زەمان تەواو دەبێت. آمین.

**جیاوازیەکان:**

١. لە ووتەی متیٰ وا دەردەکەوێت کە مەریەمەکان لە کاتی بەرە بەیان چوون بۆ لای گۆڕەکە بەڵام مرقس کاتەکەی تێکەڵاو کردووە و ووتویەتی کاتێکی زوو کە رۆژهەڵات وە ئافرەتەکانیش سێ بوون. (مریەمی مەجدەلیە -مریم دایکی یعقوب - سالومە). وە مرقسیش دەڵێت ئەوانە چوو بوون (حنوط) کە رۆنی گیایە بکرن و یسوعی پێ چەور بکەن.

بەڵام ڕۆژەکە شەممە بووە ئەوانیش بە شەممە کڕین و فرۆشتنیان نەکردووە. بەڵام لۆقا دەڵێ ئەوان ڕۆنەکەیان لەپێش شەممەدا کڕی و وە دەڵێت ئەوانەی چوو بوون بۆ لای گۆڕەکە چەند ئافرەتێك بوون کە لەگەڵ یسوع لە شاری جلیل بوون وە خەڵکێکی زۆریان لەگەڵ بوو کە ژمارەیان ئەژمارکراوە وە ئایا پیاو بوونە یا ئافرەت، وە دەڵێت لەناو ئافرەتەکان مریەمی مەجدەلیە و مریەمی دایکی یعقوب و یۆنان لێرەدا ناوی سالومە بزر بوو وە یۆنان هاتە ناویان. بەڵام یوحنا دەڵێ: ئەو ئافرەتەی چووە لای گۆڕەکە تەنها مریەمی مەجدەلیە بووە بە تەنها و کاتەکەشی تاریك بووە وە باسی ڕۆژ هەڵاتنیشی نەکردووە وەکو مرقس.

٢. لە ووتەکانی متیٰ زانرا کە ئەو دوو ئافرەتەی چونە لای گۆڕەکە بەردەکە بە دەرگاوە بوو فریشتە هات و بەردەکەی لابرد. بەڵام مرقس دەڵێ کە ئافرەتەکان چوون بەردەکە بە دەرگای گۆڕەکە نەما بوو. بەڵام لۆقا لەگەڵ مرقس یەك دەنگە کە بەردەکە لاکەوتبوو.

٣. متیٰ دەڵێ: فریشتەیەك هات و بەردەکەی لادا و بە دوو ئافرەتەکەی ووت یسوع هەڵساو دەیەوێ لە جلیل چاوی بە قوتابیەکان بکەوێت و دوو ئافرەتەکە سەیری جێگای مەسیحیان کرد، بەڵام مرقس دەڵێ ئەوەی ئەم قسانەی بە دوو ئافرەتەکە ووت گەنجێك بوو لە لای ڕاستی مەسیحدا دانیشت بوو لە ناو قەبرەکە وە لوقا دەڵێ کە دوو ئافرەتەکە چوونە ژووری گۆڕەکەی مەسیحیان نەدیتوو سەریان سوڕما وە لە پڕێکەوە دیتیان پیاوێك بە جل و بەرگی جوان ووتی بۆ بە دوای زیندوو دەگەڕێن لە نێو مردوان ئەوا لە جەلیل چاوە ڕێیە بچنە لای. وە یوحنا دەڵێ:

تەنها مریەمی مەجدەلی چوو بۆ لای گۆڕەکە و دیتی بەردەکە بەرز کرا بوەوە لەسەر قەبر و یەکسەر بەپەلە گەڕایەوە و چووە لای سمعانی بطرس ئەو قوتابیەی کە یسوع زۆری خۆش دەویست پێی ووت مەسیح دزراو بردیان.

٤. متیٰ دەڵێ: کە دوو ئافرەتەکە هاتن بچن بە قوتابیەکان رابگەیەنن کە فریشتە ووتی بڕۆنە جلیل لە رێگا گەیشتنە یسوع ...هتد. بەڵام مرقس دەڵێ ئەوان بە پەلە هاتنەوە هەڵاتن بەپەلە و زۆر ترسان و هیچ قسەیەکیان نەکرد و وە دەڵێ یەکەم جار فریشتەکە بۆ مریەمەی مەرجدەلیە بە دیارکەوت و پاشان بۆ ئەوەی تر گەڕانەوە و چونە لای ئەوانەی لەگەڵی بوون و دەگریان. کە گوێیان لێبوو یسوع زیندووە و دیتویانە باوەڕیان نەکرد. بەڵام لۆقا دەڵێ: چوونە لای رەسولەکان و پێیان گوتن ئەوانیش باوەڕیان پێنەکردن.

وە لۆقا بە تەنها ئەوە دەڵێ کە بطرس بە پەلە هاتە لای گۆڕەکە و سەری خۆی شۆڕکردەوە بۆ ناو گۆڕ و تەنها کفنی دیت و سەری سوڕما....

بەڵام یوحنا دەڵێ: لەسەر زمانی مریەمەی مەجدەلی خەبەرەکە هات و ئەوانەی چوونە لای گۆڕەکە دوو کەس بوون بطرس و ئەو قوتابیەی کە مەسیح زۆری خۆش دەویست.

وە یوحنا دەڵێ؛ مریەمەی مەجدەلیە جارێکیتر هاتەوە بۆ لای گۆڕەکە و سەیری کرد دوو فریشتە یەکێکیان لە لای سەری ئەوی‌تر لە خوار پێیەکانی مەسیح دانیشت بوون لێیان پرسی بۆ دەگری ئەویش ووتی مامۆستاکەیان بردووین نازانین بەرەو کوێیان بردووە. لەم کاتەدا مریم

ئاوری داوه یسوعی دیت بەڵام وای زانی کە (بوستانیە) وە پێی ووت ئەی گەورەم ئەگەر تۆ هەڵتگرتووە پێمان بڵێ لە کوێ دات ناوە من دەیهێنمەوە، یسوع ووتی ئەی مریم ئەویش ووتی (ربونی) واتە ئەی مامۆستا.

٥- وە مرقس دەڵێ: یسوع دەرکەوت لە لای دووکەسی تر و دیتیان بە قوتابیەکانی ووت بەڵام باوەڕیان نەکرد. وە مرقس دەڵێ دوو کەسی تر دەچوونە شارۆچکەی (عمواس) یسوع لێیان نزیك بووەوە ئەوانیش گفتوگۆیان بوو لەسەر باسی کوشتنی مەسیح و بزربوونی و هەڵسانەوەی لە نێوان مردوان و وەچاویان مەسیحی لەبیر چوبوەوە. مەسیح پێی ووتن ئەوە باسی چی دەکەن و دەڕۆن بە ڕووگرژی، یەکێکیان کە ناوی (کلیوباس) بوو وەڵامی دایەوە ووتی چۆن ئەت زانیوە چی لە ئوورشلیم ڕوویداوە، ووتی چی ڕوویداوە کلیوباس ووتی ئەو هەواڵانەی تایبەتن بە یسوعی ناصری ئەوەی کە مرۆڤ بوو پێغەمبەر بوو کاربەجێ و کاربەدەست بوو بەرامبەر خوای گەل وە چۆن سەرۆکی بازان دایان دەست کاربەدەستان و لە خاچ دراو ئێمە تکامان وایە کە ئەو ببێتە قوربانی تاوانەکانی بەنو ئیسرائیلیەکان.

بەڵام لەگەڵ ئەمەش ئەوە سێ ڕۆژە ئەم تاوانە ڕوویداوە، بەڵکو هەندێك لە ئافرەتەکانی ئێمەیان خستۆتە گێژاوی سەرسوڕمان کە کاتی زوو چوونە لای گۆڕەکەی و ئەیان دۆزیەوە و ئێمە شێوەی فریشتەمان دیتون زیندوبوونەوە هەندێك لە پیاوەکانمان چووبوونە لای گۆڕەکەی و هەر بەم شێوەیە دیتبویان، بەڵام عیسایان نەدیتوە -عیساش- ئەو دوو

پیاوە نەیان دەزانی عیسایە ترساندنی و ووتی: ئەی نەزان و دڵ سست بەرامبەر کتابی خوا، وە باسی هەموو شتێکی بۆ کردن کە نەزانرابوون هەر لە کاتی موسـاوە تـا ئـەولوی پێغەمبـەران. وە ئـەم دوو پیـاوە زۆر داوایان کرد لە لایان دانیشێ ئەویش لـە لایان دانیشت و وە نانی وورد کرد و دەیدایە دەستیان ئەوانیش چاویان هەڵێنا و عیسایان ناسـیەوە یەکسەر بزربوو.

لۆقا بە تەنیا ئەم باسەی کردوە.

لە ئینجیلی بەرنابا دا هاتووە: شێوەی مەسیح خرایە سەر پیاوێکی تری یەهودیەکان و شێوەی مەسیح گۆڕا و بزربوو. کلیوباسیش ئـەی ناسـی تـا نانی بـۆ ووردکـردن و دایـە دەسـتیان و بیخـۆن و پاشـان چاویـان هـەڵێنا ناسیان ئەویش بزربوو.

لەگەل ئەم هەموو گفتوگۆیەی ئینجیلەکان تا ئێستا شاهیدێك نیـیە بە چاوی خۆی دیتبی کە مەسیح لە ناوگۆڕدا بووبێت. بەڵکو هەرچی بینیبێتـی لە دەرەوەی گۆڕا بینیوویەتی، کەواتـە هـەر ئـەم قسـەیە دەبێتـە شـاهێد کـە ئەوەی کوژراوە مەسیح نەبوە، بەڵکو مەسیح رزگاری بوو بەوەڵای ئەسخریوطی کوژرا و مەسـیح ئێسـتاش هـەر زیندوە لە کزتایی زەمانـدا دێتـە خـوارەوە و ئاینی ئیسلام بلاودەکاتەوە هەروەکو لە پێشەوە باسمان کرد.

## بەڵگەی مەسیحیەکان لە سەر خوایەتی عیسا ﷺ

مەسـیحیەکان دەسـتیان کوتـووە بـە چـەند بەڵگەیـەك لەسـەر خوایـەتی مسیح ﷺ و لەسەر ئـەوەی کە مەسیح کوڕی خوایە و لـە چـەند ئنجیلێکدا

هاتووە ووشەی (ابن الله)، بەڵام ئەم بەڵگانە رزیو و بێكارن، چونكە ئەگەر تەنها ئەم ووشەیە بەڵگە بێ لەسەر خوایەتی مسیح و بوونی مسیح بە كوڕی خوا و ئەی هەر لە هەمان ئینجیلەكانیشدا مەسیح خۆی ناوی خۆی نەبردوە بە (ابن الانسان) كوڕی مرۆڤ؟ وە بە (ابن داود) كوڕی داود؟

خۆ شتێكی روون و ئاشكرایە ووشەی (ابن) واتە كوڕ-رۆڵە- بۆ كەسێك دەگوترێت كە لە دایك و باوكێك پەیدا بووبێت وە ئاوی پیاوەكە لەگەڵ هێلكەی ناو مندالدانی دایكەكەدا یەكی گرتبێت و ئەم كوڕەی لێ پەیدا بووبێت. خۆ شتێكی بەڵگە نەویستە كە ئەمە بۆ خوا نابێ و بۆ حوای گەورە ناشێ.

جا دەبێ ئێمە مانای (ابن) بە مانایەكی (مجازی) ناڕاستەوخۆ لێك بدەینەوە، چونكە لەو سەردەم بە هەموو ئیماندارێكیان دەووت كوڕی خوا، بە كافرەكانیشیان دەووت (كوڕی شەیتان)، مەبەستیش لە (كوڕی خوا) لێرەدا بۆ مەسیح واتە بەندەیەكی دڵسۆزی خوا -خواپەرستێكی راستەقینە بەڵام خۆزگە مەسیحییەكانی ئێستاش هەر ئەم مانایەیان لێبدایەوە.

وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ وَقَالَ الْمَسِيحُ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ ۝ لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلَاثَةٍ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا إِلَٰهٌ وَاحِدٌ وَإِنْ لَمْ يَنْتَهُوا عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ۝ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى اللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُ وَاللَّهُ غَفُورٌ

رَحِيمٌ ۞ مَا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ وَأُمُّهُ صِدِّيقَةٌ كَانَا يَأْكُلَانِ الطَّعَامَ انْظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ الْآيَاتِ ثُمَّ انْظُرْ أَنَّى يُؤْفَكُونَ ۞ قُلْ أَتَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا وَاللَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ المائدة ٧٢-٧٦.

هەر کەسێك بەراورد بكات لە نێوان ئەم ئایەتانەی ئاماژەیان بۆ دەکەم لە خوارەوە لە ئینجیلەکان بۆی ڕوون دەبێتەوە کە مەسیح نەك هەر کوڕی خوا نییە، بەڵکو بەندەیەکە و پێغەمبەرە:

١- مرقس ص١٥ (٩).

٢- متی ص٥ (٩).

٣- یوحنا ص٨ (٤١).

٤- نامەی یەکەم بۆ یوحنا ص٣ (٩).

٥- ص٤ (٧) هەمان سەرچاوە نامەکەی یوحنا.

٦- ص٥ (١) هەمان سەرچاوە نامەکەی یوحنا.

٧- یوحنا ص٢٠ (١٧).

٨- یوحنا ص١٤ (٢٨).

٩- متی ص٨ (٢٠).

١٠- متی ص٩ (٦).

ئەگەر هەر کەسێك بە گوێرەی ئینجیل ناوی کوڕ بێت ئەوا دەبێت بەنو ئیسرائیلییەکان هەموویان خوا بن، چونکە بە گوێرەی ئینجیل خوا بە هەموویانی گوتوە (ابنی) هەروەکو ئەم ئایەتانەی ئینجیل:

ص٤ خروج (٢٢)،

مزمور ٨٨ (٢٠)،

ارميا ص٣٦ (٩)

صموئيلی دووەم ص٧.

وە شاعیرێك بە عەرەبی دەڵێ:

عجبا للمسيح بين النصارى
والى الله والدا نسبوه

اسلموه لليهود وقالوا
انهم بعد قتله صلبوه

فلأن كان ما يقولون حقاً
فسلوهم فأين كان ابوه

فأن كان راضيا بأذاهم
فاشكروهم لأجل ما صنعوه

وان كان ساخطاً غير راض
فاعبدوهم لانهم غلبوه

## هەڵوێستێکی عیسا ﷺ لە ڕۆژی دواییدا

﴿ وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ اللَّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِن كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ

عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ ۞ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَا أَمَرْتَنِي بِهِ أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَا دُمْتُ فِيهِمْ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ۞ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ

﴿ آل عمران ١١٦-١١٨.

واتە: لە ڕۆژی دواییدا خوای گەورە بە عیسا دەفەرموێ ئەی عیسا ئایا تۆ بە ئوممەتی خۆت وتوە خوا مەپەرستن من و دایکم بە خوا بزانن و بمان پەرستن، عیساش وەڵام دەداتەوە دەڵێ: پاکی و بەرزی هەر بۆ تۆیە من بۆم نیە هیچ قسەیەکیان پێ بڵێم ئەگەر تۆ بۆ منت دا نەنابێ، هەرچی تۆ فەرمانت پێ کردبێم ئەوەم پێ وتون و تۆش لە هەموو کەس باشتر دەزانی ئاگاداری ناو نەفسی منی بەڵام من ئاگاداری ناو نەفسی تۆ نیم ئەۆش زانستت بەرامبەر هەموو شتێك هەیە و هیچ شتێك لە تۆ وون نییە، پێیم نەوتونە تەنها ئەوە نەبێ کە تۆ فەرمانت پێ کردوم: تەنها خوا بپەرستن کە خوای من و ئێوەیە وە من شاهیدم لەسەر ئوممەتەکەم هەتا لە ناویاندا مابم بەڵام دوای بەرزبوونەوەم بۆ لای تۆ تەنها تۆ چاودێریکەری سەریانی و شاهیدی لەسەریان ئەگەر ئازاریان بدەی ئەوا بەندەی خۆتن وە ئەگەر لێیان ببوری ئەوا تۆ لە هەموو کەس بە بەزەیی تری. کەوانە ئەم پەرستنەی عیسا و مریم لەگەڵ خوا لای مەسیحییەکان بە قسەی عیسا نییە و بەڵکو عیسا لەم کارە بەرییە و دوورە.

## رووداوای عیسا (عليه السلام) لەگەڵ جولەکەیەک

لەیث دەگێڕێتەوە لە جەریر (طبری) کەوا پیاوێک داوای لە عیسا (عليه السلام) کرد کە لە سەفەرێکدا ببێتە هاوڕێی دوای بەرێکەوتن سێ کولێرەیان پێبوو، دوای ماوەیەک هەر یەکە کولێرەیەکیان خوارد و پاشان عیسا (عليه السلام) داوای کولێرەکەی تری کود و لەوێ بوو بە مشت و مریان:

عیسا: کوا کولێرە؟

جولەکەکە: نەماوە!!

عیسا: چی لێ هات؟

جولەکەکە: نازانم!!

عیسا: چون نازانی تۆ نەتخواردوە؟!

جولەکەکە: نەخێر، بە خوا نەم خواردوە و نازانم...

عیسا: با بڕۆین.

دوای ماوەیەک ڕۆیشتن: عیسا (عليه السلام) مەڕێکی دیت و دوو بەرخی هەبوو، مەڕەکەی کوشتەوە و گۆشتیان حوارد پاشان ئێسک و گۆشتی مایەوە کوی کودەوە و ووتی بە فەرمانی خوا زیندوبیەوە یەکسەر زیندوبوەوە ئینجا عیسا (عليه السلام) ووتی بە کابرا بە حەققی ئەو خودایەی ئەو موعجزەیەی نیشان دای پێم بڵێ کێ کولێرەکەی خوارد؟ ووتی نازانم.

دوای ماوەیەک گەیشتنە ڕووبارێک بەڵام زۆر قوڵ بوو، عیسا (عليه السلام) دەستی پیاوەکەی گرت و لەسەر ئاو پەڕاندیەوە ئەمەش موعجیزەیەکی تری عیسایە (عليه السلام) پاشان بە پیاوەکەی ووت بە حەققی ئەو خودایەی ئەم موعجیزەیەی نیشان دای پێم بڵێ کێ ئەم کولێرەیەی خوارد؟ ووتی نازانم.

پاشان عیسا (عليه السلام) هەندێك زیخ و ڕەملی کۆکردەوە دەستی پیان کردەوە بۆ ئاسمان وەتی: بە فەرمانی خوا ببە بە زێڕ، بوو بە زێڕ و کردی بە سێ بەش پیاوەکە وەتی ئەمە بۆ کێیە؟ عیسا (عليه السلام) وەتی یەکیان بۆ مـن و یەکیان بۆ تۆ و یەکیان بۆ ئەو کەسەی کولێرەکەی خواردوە، پیاوەکە وەتی مـن خـواردم، عیسـا (عليه السلام) وەتـی کەواتـە هـەمووی بـۆ تـۆ و لـێرەوە مـن هاوڕێیەتی تۆ ناکەم و ڕۆیشت. پاشان دوو پیاوی خراپ هاتن ویستیان زێڕەکەی لێ بستێنن بەڵام لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کە یەکێو بەشێك لە زێڕەکە هەڵگرن، ئینجا وەتیان با یەکێك بنێرینە بازار جل و بەرگی پاشایانەمان بۆ بێنێ و خواردنی خۆشمان بۆ بێنێت، یەکیان چوو بۆ بازار لە ڕێگادا بیری کردەوە من ئەم خواردنە ژەهراوی بکەم باشە کە بە خواردنەکە مردن هەموو زێڕەکـە بـۆ مـن دەبێـت. وە دوو پیاوەکـەی تریـش بـە یـەکتریان ووت کـە هاوڕێکەمان هاتەوە بە هەردوکمان دەیکوژین و بەشەکەی ئەویش بۆ خۆمان دەبێت. کە پیاوەکە هاتەوە ئەوان بە هـەردوکیان لێیان داو کوشتیان ئـەیان زانی ئەویش خواردنەکەی ژەهراوی کردوە کە ئەوانیش نانەکـەیان خـوارد هـەردوکیان مـردن. پاشـان عیسـا (عليه السلام) گەڕایـەوە لـە سـەفەرەکەی زۆر لـە قوتابییەکانی لەگەڵی بوون وەتیان ئەم سێ کەسە چین لێرە مردوون؟ زێڕ و زیویان لەلا دیارە عیسا وەتی سەیریان مەکەن و خێرا بڕۆن ئەوانە شـەهیدی دونیان خوتان لێیان بپارێزن.

## بانگەوازی ئیسلامی

## بۆ خاوەن پەرتوکە ئاسمانییەکان

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴾ آل عمران ٦٤.

ئەم ئایەتە پیرۆزەدا بەدەردەکەوێت کە ئاینی ئیسلامی پیرۆز میانڕەوی پیادە دەکات[1] وەکو ئاینەکانی تر نییە لە کاتی گۆڕانکاری بەسەر ئاینەکانی تردا هاتووە و پێش گۆڕانکاریش هەروەکو بانگیان دەکات (قل يا أهل الكتاب) یا محمد ﷺ بڵێ: ئەی خاوەن پەرتوکە ئاسمانییەکان واتە مەسیحی و جولەکە: (تعالوا) وەرن با بەیەکەوە دانیشین و گفتوگۆ بکەین و

[1] نموونەی ئەم میانڕەوییە: لە ئاینی جولەکەدا لە باسی قەتلدا تۆڵە و عەفو نیە بەڵکو دەبێ بکوژرێنەوە، وە لە ئاینی مەسیحیدا کوشتنەوە نیە بەڵکو دەڵێن یەکێک کوژراوە با نەمێنە دوو، بەڵام لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا عەفو کردن هەیە و تۆڵە سەندنیش هەیە واتە وەرگرتنی دیە پارەیەک لە لایەنی بکوژەکە بۆ لایەنی کوژراوەکە. ئەمە بێجگە لە گۆڕانکاری بەسەر دوو ئاینەکەی تردا هێنیت وە دوای گۆڕانکارییش: لەو کاتەی کە ئافرەت (عادە)ی بەسەردا دێت واتە دەکەوێتە حوێنی (حەیز)، جولەکەکان ئاوێتەی لەگەڵ ناخۆن و هیچ هەڵس و کەوتێکی لەگەڵدا ناکەن بەڵام مەسیحییەکان جماعیشی لەگەڵ دەکەن وە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا هەموو جۆرە لەزەتێک دروستە تەنها جماع کردن نەبێت، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێت (ويسئلونك عن المحيض قل هو أذى فاعتزلوا النساء في المحيض) البقرة ٢٢٢. وە حەزرەتی عائشە (رەزای خوای لەسەر بێت) دەفەرمووێت اتق مكان الدم! واتە تەنها خۆت لە شوێنی خوێنەکە بپارێزە، کەواتە تەنها جماع کردن حەرامە و لەزەت کردنی تر دروستە

ڕێککەوتننامەیەك مۆر بکەین لەسەر: (الى كلمة سواء بيننا وبينكم) لەسەر ووشەیەك کە لە نێوان ئێمە و ئێوەدا کە یەکتا پەرستی و بەندایەتی کردنە بۆ زاتی خوا ئەمەش لە هەر سێ ئاینەکەدا بنچینەی بیروباوەڕە: (ان لا نعبد الا الله ولا نشرك به شيئا) کەوا تەنها بەندایەتی زاتی خوا بکەین و شەریکی بۆ ئەنجام نەدەین چونکە خوا یەکە و تاك و تەنیایە. ﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا ﴾ واتە ئەگەر جگە لەو خودایە چەند خوایەکی تر هەبوونایە ئەوا زەوی و ئاسمانەکان تێك دەچوون، کەواتە ئەنجامدانی شەریك یان خێزان یا ڕۆڵە بۆ خودا کارێکی ناڕەوایە (ولا يتخذ بعضنا بعضا اربابا من دون الله) وە هەندێکمان هەندێکی تر نەکەین بە خوای خۆمان و بیان پەرستین وەکو مەسیحییەکان دەڵێن عیسا ﷺ کوڕی خوایە لە عیبادەتدا ناوی دێنن و جولەکەکانیش هەر ئەوها بۆ عزیر ﷺ چونکە دەبێ مرۆڤ تەنها بەندەی خوا بێت و هەرکەسێك جگە لە خوا بپەرستێ ئەنجامدانی هاوبەشە بۆ خوا (فأن تولوا فقولوا اشهدوا بأنا مسلمون) جا ئەی محمد ﷺ وە ئەی ئوممەتی ئیسلام ئەگەر مەسیحییەکان یا جولەکەکان بە دەم ئەم بانگەوازە نەهاتن و سووربوون لەسەر باوەڕی خۆیان ئێوە پێیان بڵێن: شاهید بن ئێمە موسڵمانین و جگە لە خوا هیچ کەسێکی تر نا پەرستین.

## سەرە و کورتە کردن لە ئاییندا

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَا تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ وَلَا تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ إِنَّمَا الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ اللَّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَلَا تَقُولُوا ثَلَاثَةٌ انْتَهُوا خَيْرًا لَكُمْ إِنَّمَا اللَّهُ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ سُبْحَانَهُ أَنْ يَكُونَ لَهُ وَلَدٌ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ وَكِيلًا ۞ لَنْ يَسْتَنْكِفَ الْمَسِيحُ أَنْ يَكُونَ عَبْدًا لِلَّهِ وَلَا الْمَلَائِكَةُ الْمُقَرَّبُونَ وَمَنْ يَسْتَنْكِفْ عَنْ عِبَادَتِهِ فَسَيَحْشُرُهُمْ إِلَيْهِ جَمِيعًا ﴾ النساء ١٧١-١٧٢ واتە:

ئەی خاوەن پەرتوکە ئاسمانی‌یەکان -مەسیحی‌یەکان و جولەکەکان- سەرە و کورتە (افراط و تفریط) مەکەن لە ئایینی خوتاندا چونکە هەموو کاتێك میانڕەو (وسطیة) باشترە. (ولا تقولوا على الله الا الحق انما المسیح عیسى ابن مریم رسول الله وكلمته القاها الى مریم وروح منه) واتە: عیسا ﷺ پلەی خۆی هەیە و لەم ئاستە بەرزتری مەکەنەوە، ووتەی ناڕەوا بەرامبەر بە خوا مەڵێن و مەسیح: عیسا کوڕی مەریەمە و بەندەی خوایە و رەوانە کراو و پەیامبەری ئەوە بۆ بەنی ئادەم بۆ رزگار کردنیان لە بەندایەتی کردنی مرۆڤەکان و دار و بەرد بۆ بەندایەتی خوای گەورە جا ئەگەر پێتان سەیرە کوڕی خوا نی‌یە (كلمته) واتە فەرمانی خوایە بۆ ئەو کە فەرمووی (كن) واتە ببە ئەویش بەم فرمانە لە ناو سکی دایکی دروست بوو وە خوای گەورە لە رووحی خۆی ئەلخی کرد و دروستی کرد (فآمنوا با لله ورسله) کەواتە باوەڕ بە خوا و تەواوی پێغەمبەرەکانی خوا بهێنن (ولا تقولوا ثلثة انتهوا خيراً لكم)

وە ئەڵێن خوا سێیە هەروەکو مەسیحییەکان لە کاتی نوێژدا دەڵێن: (باسم الاب والابن وروح القدس) کە لێرەدا مەبەستیان لە (الاب) خوایە و لە (ابن) عیسایە و وە(روح القدس) جبریلە ﷺ ئینجا خوای گەورە دەفەرموێ: واز لەم بیروباوەڕە بێنن چاکترە بۆ ئێوە (انما الله اله واحد) چونکە خوا یەکە و شەریکی نییە (سبحانه ان یکون له ولد) خوای گەورە زۆر لەوە گەورەترە کە کوڕی هەبێ، هەروەکو لە سورەتی (الاخلاص)دا باسمان کرد. کەواتە خوای گەورە کوڕی نییە هەتا ئێوە بڵێن عیسا کوڕی خوایە (له ما في السموات وما في الارض وكفى بالله وكيلاً) واتە: ئاسمان و زەوی و هەرچی لە ناویاندا هەیە هەمووی موڵکی خودایە وە خوای گەورە بەسە بە تەنها بکرێتە دۆست و راسپاردەی ئیشێك (لن یستنكف المسیح ان یكون عبدا لله) عیسا ﷺ خۆی بە گەورە نەدەزانی بەڵکو عیبادەتی ئەواوی خوای گەورەی دەکرد (ولا الملئكة المقربون) وە فریشتە نزیکەکانی خواش هەروان (ومن یستنكف عن عبادته فسیحشرهم الیه جمیعاً) واتە هەر کەسێك خۆی بە گەورە بزانێت لە ئاست بەندایەتی کردن بۆ خوا ئەوا دەبێ بزانێت رۆژێك دێت بێتەوە لای خوای گەورە و حسابی لەگەڵدا دەکری.

## باوەڕی موسڵمانان

﴿ آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ﴾ البقرة ٢٨٥.

واتە: حەزرەتی محمد ﷺ باوەری هێناوە بە خوا و بە هەر شتێك كە لە لایەن خواوە هاتبێت وە ئیماندارانیش هەموویان باوەریان هێناوە بە خوا و فریشتەكان و پەرتوكە ئاسمانی‌یەكان كە (تـورات) و (انجیـل) و (زبـور) و (قرآن)ن وە بە پێغەمبەرەكان، وە دەڵێن جیاوازی ناكەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێك بەڵكو باوەر بە هەموویان دەكەین كە راستگو بوونە و رێزی تایبەتیان هەبووە لە لایەن خوا. وە دەڵێن گوێ رایەڵین و فەرمانەكانت جێبەجێ دەكەین. ئەی خودایە لێ خوشبونمان پێ ببەخشە چونكە گەرانەوە بۆ لای تۆیە.

## المباهلة

﴿ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ۞ فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ ۞ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ۞ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ آل عمران ٦٠-٦٣.

واتە: راستی و تەواوی هەر لە خوداوەیە یا محمد ﷺ هیچ گومانت نەبێت و خۆراگر بە لەسەر بیر و باوەرەكەت. وە هەر كەسێكیش موناقەشەی لەگەڵ كردی تۆش داوای موباهەلەی لێ بكە، (مباهلـة) واتـە: هەردوو جەماعەت لە خوا بپارێنەوە كە لەعنەت لەو چینە بكات كە درۆ دەكات. ئەوە

بوو وەفدێكی مەسیحی‌یەكانی نەجران هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ وتیان بۆچی تۆ جوێن بە عیسا ؑ دەدەیت. ئەویش فەرمووی من چیم وتوە، وتیان تۆ دەڵێی عیسا بەندەی خوایە و پێغەمبەریەتی كوڕی ئەو نی‌یە، ئەویش فەرمووی نەخێر بەندە و رەوانەكراوی خوایە و ووشەی خوا بۆ مەریەمە هاتووە روحی خوا بۆی هات و عیسای ؑ لێ دروست بوو ئەوانیش توڕە بوون، پێغەمبەریش ﷺ داوای موباهەلەی لێ كردن، ئەوانیش وتیان باشە بەڵام ماوەمان بدە، كۆبونەوەیەكیان لە نێوان خۆیاندا كرد و وتیان ئەی ئەتان زانیوە هەر قەومێك موباهەلەی لەگەڵ هەر پێغەمبەرێك كردبێت لەناوچووە، كەواتە ئێمە موباهەلە ناكەین، بەیانی چوونەوە وتیان ئێمە موباهەلە ناكەین و سوڵحیان لەگەڵ كرد كە جزیە بدەن. هەر چەند پێغەمبەر ﷺ خۆی و ئەهلی بەیتی دەرچووبوون بۆ موباهەلە چونكە دەیزانی ئەو راستە و لایەنی بەرامبەری درۆ دەكات.

## پسوولەی لێخۆشبوون و پسوولەی بێ‌بەش بوون

(سكة الغفران) واتە: پسوولەی لێ خۆش بوون هەر كەسێك ئیتتفاق لەگەڵ قەشەی مەسیحی‌یەكان بكات پارەی داوا كراوی بداتێ ئەوا (سكة الغفـــران)ی دەداتـــێ و بەهەشـــتی بـــۆ مســـۆگەر دەكـــات، بـــەڵام ئەگـــەر دەوڵەمەندێكی مەسیحی ئەوە نەكات ئەوا (سكة الحرمان)ی دەداتێ، واتە بێ‌بەش بوون لە بەهەشت. مامۆستایەك وتی: لە ئەمەریكا دوای نوێژی هەینی لە لایەن جالیەی ئیسلامی لەوێ، بەرپرسێكی وەزارەتی ناوخۆ هات و داوای كرد كە جالیەی ئیسلامی چەند مامۆستایەك ئەوخان بكەن و بیان

ئێزن بو بەندیخانەکان دەرس بە بەندکراوەکان بڵێن و ئامۆژگاریان بکەن، جا مەسئول ئەوی بە بەرپرسەکەی ووت بوچی ئێوە قەشەکانی خۆتان نا ئێرن بۆ بەندیخانەکان؟ ئەویش لە وەڵامدا ووتی: ئێمە ئەم تەجروبەیمان کردوە بەلام قەشەکە لەسەر مەبلەغێکی پارە لەگەڵ دزە بەندکراوەکە یا قاتلەکە یا .. هتد ریک دەکەوتن و (سکة الغفران)ی دەدانێ کابرا زیاتر دزی دەکرد و تاوانی دەکرد چونکە تازە بەهەشتی مسوگەر کردوە کە ئەمەش زیاتر تاوان و فەسادی زیاد دەکات لە کومەڵدا، بەلام ئاینی ئێوە گشت تاوانێك بنەبردەکات.

## بۆچی جولەکەکان رقیان لە عیسا ﷺ بوو ؟...

## بۆچی هەوڵیان دا بیکوژن ؟...

پیاوانی ئاینی جولەکە بە شێوەیەك خەڵکەکەیان زێردەستکردبوو کە لە هەوا و ئارەزووی ئەوان دەرنەچن ئەوانیش ژیانێکی زۆر خوشیان دەبردەسەر لە سەر حیسابی ئەم خەڵکە، بەلام عیسا ﷺ خەڵکەکەی تێگەیاند کە بەندایەتی و ماڵ خەرجکردن و خزمەتکردن تەنها بۆ خوایە نەك بۆ پیاوانی کلیسا، جا پیاوانی دەسەلاتداریش هەرئەوها رقیان لێبوو چونکە دەبوە هۆی جیابوونەوەی خەڵك لەم دەسەلاتدار و پیاوە ئاینیيانە.

## هەڵس و کەوتی موسڵمانان بەرامبەر بت پەرست و ئەهلی کتاب

بەڵێ لەبەر ئەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بۆ هەموو شتێك بەرنامەی داناوە، لە بارەی پەیوەندی مرۆڤی موسڵمان لەگەڵ خەڵکانی تر بەرنامەی خۆی داناوە لەسەر بنچینەی یەکسانی و میانڕەویدا. ﴿لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ ۞ إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَنْ تَوَلَّوْهُمْ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ الممتحنة ٨-٩.

لێرەدا عەدالەتی ئیسلامی بە تەواوی دیاری دەبێت کە فەرمان دەکات (بر) کە بەرزترین پلەی چاکەیە بیکەین لەگەڵ ناموسڵمانان ئەگەر بت پەرستیش بن مادام شەڕ لەگەڵ موسڵمانان نەکەن و دەریان نەکەن لەناو ماڵ و خانوویان. بەڵام خوای گەورە قەدەغەمان دەکات لە هاوکاری کردن لەگەڵ ئەوانەی شەڕ لەگەڵ موسڵمانان دەکەن یا لەناو ماڵ و خانوویان دەریان دەکەن چونکە پێشێل کردنی ماڤی موسڵمانە.

### بە تایبەت (ئەهلی کتاب)

لەبەر ئەوەی خاوەن پەڕتوکە ئاسمانییەکان لە زۆر شت لەگەڵ موسڵمانان یەك دەگرنەوە هەڵس و کەوتمان دەبێت زۆر باشتر بێت

لەگەڵیان، قورئانی پیرۆز کە ناویان دەبات بە: (یا أهل الکتاب) یان (یـا أیهـا الذین اوتو الکتاب) ئەوە دەگەیەنێ کە برایەتییەک هەیە لە نێوانیاندا بەڵام خاوەنی پەوتووکەکان مەسیحی و جولەکە گۆڕانکاریان بەسەر ئاینی خۆیاندا هێناوە و لایانداوە. لەبەر ئەوە ئێستا واتە دوای هاتنی قورئانی پیرۆز هیچ ئاینێک قەبول ناکرێت.

﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴾
آل عمران ٨٥.

چونکە دەبێت هەموویان لەگەڵ ئێمە باوەر بەم ئاینە بکەن و باوەر بە ئاینەکانی تریش بکەین: ﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰ أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ ﴾ الشوری١٣.

واتە: خوای گەورە ئاینێکی داناوە کە وەسیەتی پێ کردوە لە نوح بۆ تـۆی ڕەوان کردوە وە بۆ ابراهیـم و موسا و عیسا فـەرمانی پێکـردوون جیاوازی و پەوتەوازەیی مەکەن. وە دەفەرموێ: ﴿ قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ إِلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ ﴾
البقرة ١٣٦.

واتە: ئەی موسڵمانان ئێوەش بڵێن باوەڕمان هێناوە بە (قرآن) کە بۆ پێغەمبەر محمد ﷺ هاتووە وە باوەڕمان هێناوە بەو سروشەی کە بۆ ابراهیـم

و اسماعیل و اسحاق و یعقوب و اسباط کورانی یعقوب وە هەرچی بۆ موسا و عیسا هاتووە جیاوازی لە نێوان هیچ پێغەمبەرێك ناكەین و بۆ خوا موسڵمانین.

وە خوای گەورە فەرمانی بە موسڵمانان کردوە کە موناقشە لەگەڵ ئەهلی کتاب ئەکەن تەنها بە شێوەیەکی جوان نەبێت.

﴿ وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ وَقُولُوا آمَنَّا بِالَّذِي أُنزِلَ إِلَيْنَا وَأُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمْ وَاحِدٌ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ ﴾ العنکبوت ٤٦.

واتە: موناقشە لەگەڵ خاوەن پەرتوکە ئاسمانیەکان (مەسیحی و جولەکە) مەکەن تەنها بە شێوەیەکی جوان نەبێت، مەگەر کەسانێك ستەم بکەن، وە پێیان بڵێن ئێمە باوەڕمان هەیە بە (قرآن و تورات و انجیل و زبور) وە خوای ئێمە و ئێوە یەکە و دەبێت هەموومان هەر ئەو بپەرستین وە بۆ خوا مل کەچین.

## جیاوازی مەسیحی و جولەکە

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِّلَّذِينَ آمَنُوا الْيَهُودَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ قَالُوا إِنَّا نَصَارَىٰ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۞ وَإِذَا سَمِعُوا مَا أُنزِلَ إِلَى

الرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا مِنَ الْحَقِّ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّٰهِدِينَ ۞ وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَمَا جَآءَنَا مِنَ الْحَقِّ وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ الْقَوْمِ الصَّٰلِحِينَ ۞ فَأَثَٰبَهُمُ اللَّهُ بِمَا قَالُوا جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَذَٰلِكَ جَزَآءُ الْمُحْسِنِينَ ﴾ المائدة ٨٢-٨٥.

واتـه: لـه هـەموو كـەس زيـاتر دوژمنـداری ئیمـانداران دەكـەن و ڕق و كینەیان لە دڵە ئەوانەی بت پەرست و جولەكەن واتە لێرەدا جولەكەش بوونە هاوشانی بت پەرستەكان، وە لـە هـەموو كـەس خوشەويسـتر و دڵ خاوێنـتر بەرامبـەر ئیمـانداران ئـەو كەسـانەن كـە دەڵێـن ئێمـە نەسـاراین واتـە مەسیحیـیەكان هۆی ئەمەش ئەوەیە قەشە و راهب لـە ناویاندا هـەن و خـوا دەناسن و خۆیان بە گەورە نازانن و ناز و فیز لێ نادەن. وە ئەگەر گوێیان لـە قورئان بوو دەبینی چاویان پڕ فرمێسك دەبێت چونكـە حـەق دەناسـن و دەڵێن خوایـەگیان باوەڕمـان هێنـا و لەگـەڵ شـاهێدەكان بمـان ژمـێرە وە هەروەها دەڵێن: جا چون ئێمە باوەڕ نەهێنین كە ڕاستیمان بۆ ڕوون بوەوە، واتە لە ئینجیلدا ناوی ئەم پێغەمبەرە هاتووە وە حەز دەكەین خوای گەورە لەگەڵ پیاوچاكان بمان ژمێرێت، خوای گەورە دەفەرموێ جا لەبەر ئەم ووتە ڕاستانە ئیمەش ئەوەی وا بڵێ و باوەڕی بەم جورە بێت پاداشتی دەدەینـەوە و دەیبەینە بەهەشت لە ڕۆژی دوایدا ...هتد.

كەواتە بومان ڕوون بوەوە كە چون مەسـیحییەكان خـاوەن بـاوەڕن و جولەكەكانیش كەس سیقەیان پێ ناكات چونكە لە سەردەمی پێغەمبـەر ﷺ پـەیمانیان مـور دەكـرد و پاشـان لێی پاشـگەز دەبوونـەوە، یـان فێـڵ و

ته‌ڵه‌که‌بازیان ده‌کرد و موئامه‌ره‌یان دژی موسڵمانان ده‌کرد و ده‌چوونه لای بت په‌رسته‌کانی مه‌ککه و ده‌یانگووت ئایینی ئێوه له ئایینی ئیسلام باشتره وه‌رن با به‌یه‌که‌وه محمد ﷺ و هاوه‌ڵه‌کانی له‌ناو ببه‌ین و ...هتد. که ئێستاش له هه‌موو جیهاندا هه‌ر خه‌ریکی شه‌ڕ و ئاژاوه و فیتنه‌ن[1].

---

[1] کاتێك ئایه‌تی: مَنْ ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً ... دابه‌زی ڕۆژێکیان حه‌زره‌تی ئه‌بوبکر ﷺ له‌ناو شاری مه‌دینه به پێش ده‌رگای کلێسای جوله‌که‌کاندا تێپه‌ڕی، مجبوری کلێساکه ناوی (فنحاص) بوو بانگی کرد و ووتی: یا ئه‌بابکر ئه‌گه‌ر خوای ئێوه فه‌قیر نه‌بێت بۆ داوای قه‌رزی کردوه، مه‌به‌ستی له‌م قه‌رزه چی‌یه خۆ خوای گه‌وره ده‌وڵه‌مه‌نده و هه‌ر ئه‌و ڕزق و ڕۆزی ده‌دات به مرۆڤ به‌ڵام مه‌به‌ستی یارمه‌تی دانی هه‌ژارانه هه‌ر که‌سێك یارمه‌تی هه‌ژارێك بدات واته قه‌رزێکی له‌گه‌ڵ خوای گه‌وره کرد، جا له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌م جوله‌که‌یه هه‌روه‌کو عاده‌تی خۆیان به ئسلوبێکی ناشیرین و گاڵته کردن به ئایینی ئیسلام که ئه‌مه‌ی ووت حه‌زره‌تی ئه‌بوبکریش شه‌قه‌زلله‌یه‌کی له ده‌مه‌ودا و ددانه‌کانی شکاندن و خوێنی له ده‌م و لووتی هاته خواره (فنحاص) به هه‌ڵه‌ داوانی و به‌کسه‌ر چووه لای پێغه‌مبه‌ر ﷺ شکایه‌تی له ئه‌بوبکر کرد و ووتی ئه‌ی محمد ئایینی هاوه‌ڵه‌کانت چۆن بوونه دڕنده و ئه‌مه‌دا له حه‌ڵکی ده‌که‌ن، ئه‌ویش ووتی چی‌بووه؟ ووتی ئه‌وه ئه‌بوبکر به‌م هۆ شه‌قێکی لێدام و ده‌م و لووتی پڕ له خوێن کردم ئه‌ویش به دوای ئه‌بوبکری دا نارد و ووتی بۆچی وات له فنحاص کردووه لێره‌دا چونکه هیچ شاهێدێك له‌وێ نه‌بوو له‌وانه‌یه قسه‌ی فنحاص به ڕاست بزانرێ، به‌ڵام خوای گه‌وره هاته ناو باسه‌که و حه‌زره‌تی جبریل ﷺ ناردبه خواره‌وه ئه‌م ئایه‌ته پیرۆزه‌ی هێنا: ﴿ لَقَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَاءُ سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا وَقَتْلَهُمُ الْأَنْبِيَاءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ ● الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ عَهِدَ إِلَيْنَا أَلَّا نُؤْمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّى يَأْتِيَنَا بِقُرْبَانٍ تَأْكُلُهُ النَّارُ قُلْ قَدْ جَاءَكُمْ رُسُلٌ مِنْ قَبْلِي بِالْبَيِّنَاتِ وَبِالَّذِي قُلْتُمْ فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴾ آل عمران ١٨١.

واته خوای گه‌وره گوێی لێ بوو له‌و که‌سانه‌ی ووتیان خوا فه‌قیره داوای قه‌رزی کردووه وه ئێمه‌ش ده‌وڵه‌مه‌ندین، ئێمه ئه‌م قسه‌یه ده‌نووسین گرنگی بۆ داده‌نێین، چونکه حیسابی زۆری له‌سه‌ره خۆ ئه‌وان هه‌ر ئه‌م ئاوانه‌یان نه‌کردووه، به‌ڵکو چه‌ندین پێغه‌مبه‌ریان کوشتوون وه‌کو یحیی و زکریا ..هتد که ده‌شیان کوشتن ته‌نها له‌سه‌ر ئایینه‌که‌یان بوو هیچ هۆیه‌کی تری نه‌بوو، جا ئێمه پێیان ده‌ڵێین بچێژن سزای ئاگر و ئێژ له ناو دۆزه‌خدا، ئه‌وانه‌ی ده‌یان ووت خوا په‌یمانی له ئێمه وه‌رگرتووه که

## لە ووتە پیرۆزەکانی حەزرەتی عیسا ﷺ

١- حەزرەتی عیسا ﷺ فەرموویەتی: دونیا سێ رۆژە: رۆژێکیان دوێنێ بوو، واتە تەمەنی رابردوو ناگەڕێتەوە جا ئەگەر چاکەت تێدا کردبێت چاکە وەردەگریتەوە وە ئەگەر خراپەت تێدا کردبێت پاداشتت خراپە دەبێت، وە رۆژێکیان بەیانی‌یە واتە تەمەنی داهاتوو بەڵام نازانی دەیگەیێ یان نا. وە رۆژێکیان ئەمڕۆیە لە دەستت مەدە و چاکەی تێدا بکە. مەبەستی حەزرەتی عیسا ﷺ کات بە فیڕۆ نەدانە و چاکە لە دەست نەدانە واتە ئەگەر چاکەیەکت بۆ رەخسا یەکسەر بیکە و لە دەست خۆتی مەدە.

٢- حەزرەتی عیسا ﷺ فەرموویەتی: ئامۆژگاری کردن وەکو چاندنی دەغڵ وایە چۆن دەغڵ و دان لە کاتی چاندنیدا هەندێکی باڵندە هەڵی‌دەگرێتەوە و سوودی لێ نابینرێت، وەهەندێکی لەبەر ئەوەی جێگایەکەی بەردی لێیە شین نابێت وە هەندێکی شین دەبێت بەڵام لەبەر درک و داڵ نادووریتەوە و سوودی لێ وەرناگیرێت، وە هەندێکیشی شین دەبێت سوود بەخش

---

باوەر بە هیچ پێغەمبەرێك ناهێنین تا موعجیزەیەکمان نیشان نەدات ئەویش ئەوەیە کەسێك خۆزێك بکات و ماڵێك بیەخشێت لە پرێکەوە ئاگر بگرێت و بسووتێت نیشانەی قەبوول بوونە لە لای خوا ئینجا ئەی محمد ﷺ تۆ پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەرتان بۆ ئەمات بەم شێوەیەش، ئێوە کوشتتان و ئەتان هیشت بانگەوازەکەی بگەیەنێ

چونکە هەر وەکو لە پەرتوکە مێژوویییەکان و تەفسیری قورئانی پیرۆزدا دەردەکەوێت گاورەکان زۆر پێغەمبەریان کوشتووە و نەك تەنها یەك و دوو کە نیشانەی دژایەتی کردنی ئایینی خوایە هەر لە سەرەتا و تا ئێستاش

دەبێت. ئامۆژگاریش هەر ئەوهایە هەندێکی لەگەڵ هەوا دەروات و کەس گوێ بۆ ناگرێت وە هەندێکی گوێی بۆ دەگیرێت بەڵام ئامۆژگاری کراوەکە هی ئەوە نیە ئامۆژگاری بکرێت چونکە کاری پێ ناکات وە هەندێکیشی کاریشی پێ دەکات بەڵام لەبەر زۆری تاوانەکانی چاکەکە نادورێتەوە و سوود بەخش نابێت وە هەندێکیشی سوود بەخش دەبێت و وەکو ئەو دەغڵەی لە جێگایەکی باش بچێنرێت وایە.

تم بحمد الله تعالى وبتوفيقه

اللهم تقبل منا واجعل اعمالنا خالصة لوجهك الكريم واجعلها ذخراً في صحائف اعمالنا الصالحة ليوم القيامة ....آمين.

## زاراوەکان

| | |
|---|---|
| ص(١) | اصحاح و ژمارەی ئایەتی ئینجیل |
| مەراق | ئاوات - ئارەزوو |
| قرعە | پشك لێ هاوێشتن |
| ملاك | فریشتە |
| موعجیزە | کشگیر - کارێك کەسانی تر پێ‌نەکرێت |
| تۆز | خۆڵ |
| ئارەق | بیرە - شتی سەرخۆشکەر |
| راهب | رەبەن - ئەوانەی تەنها عیبادەت دەکەن. |

## ناوەرۆك

# لەم کتێبەدا...

- وەڵام دانەوەی ئەو کەسانەی لە ژیانی عیسا (عليه السلام) دەپرســـن.
- ڕەت دانەوەی ئەو کەسانەی عیسا (عليه السلام) بە کوڕی خوا دادەنێن .
- ڕەت دانەوەی ئەو کەسانەی دەڵێن عیسا (عليه السلام) لەسەر خاچ قایم کراوە .
- بەراوردی ژیانی عیسا (عليه السلام) لە قورئان وئینجیلدا
- موعجیزەکانی عیسا (عليه السلام) لە قورئان و ئینجیلدا

ژمارەی سپاردن بە کتێبخانەی ڕۆشنبیری و هونەر (٩٫١٦٠) ی ساڵی ١٩٩٩



لە چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین / هەولێر چاپکراوە